مكتبة محمدي

# ژیاننامەی پێغەمبەری نازدارمان ﷺ

## سەردەمی مەدینە (العهد المدني)

— بەرگی دووەم —

دانراوی

د. مأمون فريز جرار　د. عمر سليمان محكل　الاستاذ. حسني أدهم جرار

گۆڕینی بۆ کوردی

انور قادر شێخانی




هەولێر ٢٠١٤ز- ١٤٣٥ك

# ژیاننامەی پێغەمبەری نازدار ﷺ

# سەردەمی مەدینە ﴿العهد المدني﴾

بەرگی دووەم


دانراوی

د. مأمون فريز جرار   د. عمر سليمان مكحل

الاستاذ حسني ادهم جرار



دار المنهل . عمان أردن

گۆرینی بۆ كوردی

انور قادر شێخانی

هەولێر

١٤٣٥-٢٠١٤

چاپی یەكەم

ژمارەی سپاردن لە كتێبخانەی گشتی(٢٤٨) سالی ( ٢٠١٤) پێدراوە

ناوی کتێب: ژیاننامەی پێغەمبەری نازدار ﷺ سەردەمی مەدینە- بەرگی دووەم
دانانی لەلایەن: - د. مأمون فریز جرار
- د.عمر سلیمان مکحل
- الاستاذ حسنی أدهم جزار
گۆرینی بۆ کوردی: انور قادر شێخانی
تایپ و دیزاین: نووسینگەی هیوا - یونس عباس إسماعیل
هەولێر: ٢٠١٤- ١٤٣٥
چاپی یەکەم
**ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی گشتی(٢٤٨) سالی (٢٠١٤) پێدراوە**

---

پێشکەش بێت بە:

- گیانی پاکی پێغەمبەر ﷺ وە هەموو هاوەڵان و شوێن کەوتوانی و زانایان و ئەولیاو خزمەت گوزارانی قورئان.
- بەدایکم و باوکم و ئاسیەخانی هاوسەرم و ئەو مامۆستاو هاورێیانەی کە یارمەتی یان دام بۆ سەرخستنی ئەم پرۆژە پیرۆزە.
- هەموو مرۆڤەکان کە بەراستی شوێن رێبازی بەختەوەری دا دەگەرێن و تادەستیان کەوێ و لە سزای دوا رۆژ رزگاریان بێت.



بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكی

الحمدلله والصلاة والسلام على رسولهِ وعلى آلهِ وصحبهِ اجمعين.

**ئـەم پەرتووكـە دووەم پەرتووكـە لـە ژیـانی پێغەمبـەرمان ﷺ وەباسـی سـەردەمی مەدینە دەكات، كەدەست پێدەكات لە كۆچ كردنی پێغەمبەر ﷺ لەشاری مەككـەی پیرۆز بۆ شاری مەدینـەی منـەوەرە وەكۆتـایی هـات بەكۆچـی دوای پێغەمبـەر ﷺ وەبریتییە لە سی (٣٠) وانـە وە باسـی زەقترین روداو چیرۆك لەسـەردەمی مەدینـە دەكات وە باسی ئەو جەنگانەی كە رووی داوە.**

**ئەو وانانەش پەیرەوی یەك لەدوای یەكی كات وسات كراوە وە چوار وانـەی كۆتـایی دانراوە بۆ باسی سیفەت وخوڕەوشـتی پێغەمبـەر ﷺ وە وامـان دانـاوە كـە هـەموو كەسێك وە لەهەر ئاستێكدا بێت بتوانێ سوودی لێ وەرگرێ وە هـەولمان داوە ئـەم زانیاریانـەی لـەم پەرتووكـە بـاس كـراون لـە سەرچـاوە وپـەرتوكی بـاوەر پێكـراوی بەناوبانگی ژیان نامەی پێغەمبەر وەرگیراوە**

**وە لەكۆتایی هەر وانەیەك چەند راهێنان وپرسیارو وەلامێك هاتووە بۆ سوودی زیاتر بۆ خوێنەران وەداواكارین لەخوای بالادەست بەهێنانە كایەی ئەم پەرتوكە بگەین بە ئامانجی خۆمان وە لەخوا دەپاڕێینەوە وداواكارین لە پاداشت بێ بەشمان نەكات.**

**امین/ خوا پشت وپەنامان بێت**

دانەران



# پێشەکی ئامادەکردنی بۆ کوردی

الحمدلله رب العالمين والصلاه والسلام على حبيب رب العالمين محمد ﷺ ومن تبعه باحسان الى يوم الدين وبعد:

براو خوشکانی بەڕێزم لەسەر داوای زۆری برای بەڕێزم ( کاك عبدالحکیم)خاوەنی پەرتووکخانەی مەحوی لە هەولێر هەڵ سام بە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە کە لەدوو بەش پێك دێت بەشێکیان باس لە سەردەمی مەککە دەکات (العهد المكی) وە بەشەکەی تریان باس لە سەردەمی مەدینە دەکات (العهد المدنی) وە پاش خوێندنەوەی وام بە چاك زانی کە بۆ خوێنەوارانی گەلی کورد بیکەمە کوردی بۆ ئەوەی سوودی لێ وەرگرن وە کەلێنێك لەپەرتووکخانەی کوردی پڕ بکاتەوە، بۆیە لەسەفەری پڕ خێری ئەمسالی (٢٠١٢) بۆ حەجی مالی خودا لەگەل خۆم بردو لەوێ لە پەنای کەعبەی پیرۆز لەمزگەوتی حەرام وە مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینەی منەوەرە هەڵسام بەدەست پێکردنی وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە نایابەوە کە لەبەرواری ٢٠١٢/١٠/٤ بوو لەهەردوو شاری مەککە ومەدینە.

وە داواکارم لەخوای بالادەست لێمان وەرگرێت وئەم نوسینەم دوور بکات لە ڕیا و ڕیابازی بە خالص بۆی بێت و لەناو کردەوە پاکەکانم تۆماری بکات ومنیش و برای بەڕێزم کاك عبدالحکیم سەرکەوتوو بکات بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام. شەرمەزاری بازاری قیامەت نەبین أمین.

انور قادر شێخانی

هەولێر

٢٠١٣/٢/٢٧ بەرامبەر ١٧ ربیع الثانی ١٤٣٤هـ



## وانەی یەکەم

# مانگی شەوی چواردە هەڵهات

شاری مەدینەی منەوەرە خۆی ئامادەکرد بۆ پێشوازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەی کە کۆچی کرد لە شاری مەککەی پیرۆز بۆ شاری مەدینەی منەوەرە بەهاوڕێیەتی ئەبوبەکری ڕاستگۆ رضي الله عنه وە خەڵکی مەدینە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیمان وبڕوای بەتین وتێکۆشان لەپێناوی خوا، هاوەڵی بەرێزی (موصعەبی کوری عومەیر) رضي الله عنه توانی پێش ئەوەی موحەمەد ﷺ کۆچ بکات، ئەو لەمەدینە ئاینی ئیسلام بلاو بکاتەوە وهەتا هیچ ماڵێ لەشاری مەدینە نەما دەنگ وباسی ئیسلامی‌تیایدا بڵاو نەبوبێتەوە.

زۆربەی زۆری هاوەڵانی پێغەمبەر لەپێش دا کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینەی منەوەرە لەپێناوی خوا وە موسلمانەکان لە شاری مەدینە چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەر ﷺ بوون ئەوەبوو هەموو ڕۆژێ بەیانیان دەچوونە نزیك قوبا لەسەر کێوی بەرز چاوەروان بوون تاکو گەرمای نیوەڕۆ زۆری بۆ دێنان دەگەڕانەوە بۆ شار.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دووشەمە ١٢ ربیعی یەکەم گەیشتە قوبا لەوکاتەی خەلکەکە گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە لەگەرمەی نیوەڕۆ بوو لە پاشان دەنگ وباس بڵاوبۆوە کەپێغەمبەر ﷺ گەیشت، لەم کاتەدا موسلمانەکان بەکەیف خۆشی پێشوازییان لەم دوو بەرێزەیان دەکرد وە سلاویان لێ کردن لە ئەبوبەکر و پێغەمبەری خوا ﷺ وە سوپاسی خوایان دەکرد لەسەر گەیشتنی پێغەمبەر بۆ شاری مەدینە بەساغ وسەلامەتی ڕزگاریان



بوو لەپیلانی دوژمنکارانی قورەیش وە خەلکی مەدینەش کۆمەڵ بەکۆمەڵ هاتن بۆ قوبا بۆ سلاو کردن وبەخێرهاتنی.

وە قوبا گوندێکی بچووك بوو جیابوو لە شاری مەدینە وە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕۆژێك لەوێ جێنشین بوو پێشوازی لەموسڵمانان دەکرد، وە لەوێ لە کاتی مانەوەی لەقوبادا مزگەوتێکی دروست کرد بەناوی مزگەوتی قوبا، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز باسی ئەم مزگەوتەمان بۆ دەکات کە دەفەرمووێ ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ واتە (مزگەوتێك شایستەیە کەتۆی تێدا بوەستێت بۆ نوێژ کردن تیایدا کە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقواو خواناسی دروستکراوە چونکە لەومزگەوتەدا چەند کەسانێکی مەردی تیایە کە زۆر حەز دەکەن خۆیان خاوێن ڕابگرن (لەدەروون ولە ڕواڵەتدا) خوایش بەردەوام ئەوانەی خۆش دەوێن کە خۆیان پاك ڕادەگرن ) تەفسیری ئاسان ل٢٠٤.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کەوا نوێژ لەم مزگەوتدا پاداشت وخێری گەلێ گەورەیە کەدەفەرمووێت (مَن تَطَهرَ فِي بَيتهِ ثُم اتى مَسجِدُ قُباءَ فصلى فيه كَاَنَ لَه كاَجرِ عُمرةَ) (رواه احمد والنسائي) واتە (کەسێ لەماڵەوە دەست نوێژ بگرێ وبچێتە مزگەوتی قوباوە وەنوێژی تیادا بکات ئەوە پاداشتی عومرەیەکی دەگاتێ )

وە مانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قوبا کاتی بوو وەلەم کاتەی کە وەختی کۆچی مەدینە هاتە دەرەوە موسلمانان بە چەکەوە لە چوار دەوری پاسەوانیان دەکرد وکەیف خۆشی وزەردەخەنەش کەوتە سەر لێوانی دانیشتوانی مەدینە وە لەڕێگادابوو کاتی نوێژی هەینی هات پێغەمبەری خواش پێش نوێژی بۆ کردن لە ناو خێلی بەنی سالم

نوێژی هەینی بۆ کردن وە خەڵکی مەدینەش دڵیان پڕبوو لە خۆشی وشادی وە ئەم چەند دێرە هۆنراوەیان دەگووتەوە:

طَلَعَ البَدرُ عَلَيَنا      مِن ثَنِياتِ الوَدَاعِ
وَجَبَ الشُّكرُ عَلَينا      مَادعا لله دَاع
ايُّها المَبعوثُ فِينا      جئتَ بِالامر المطاعِ
جِئتَ شَرفتُ المَدِينةَ      مَرحَباً يَا خَيرَ دَاعٍ

## هەڵسەنگاندن

١- روونی بکەوە چۆن شاری مەدینە خۆی ئامادەکرد بۆ پێشوازی کردنی پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆلایان؟

٢- خەلکی مەدینە چیان کرد لەو ڕۆژانەی پێش گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە.

٣- چەماوە بکێشە بە چواردەوری وەلامی ڕاست.

أ- لەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ گەیشتە قوبا

١- یەکسەر ڕۆیشت بۆ مەدینەی منەوەرە

٢- یەك شەو مایەوە دوای چووە مەدینە

٣- چەند ڕۆژێك مایەوە دوای بەڕێکەوت بۆ مەدینە

ب - پێغەمبەر ﷺ روونی کردۆتەوە پاداشتی نوێژ لەمزگەوتی قوباء دەکاتە

١- سەدنوێژ

٢- حەجێکی تەواو

٣- عومرەیەك

ج - پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی مانەوەی لەقوبا دروستی کرد

١- خانوویەك بۆ خۆی

٢- مزگەوتێك

٣- چەند خانووەك بۆ کۆچکەران

## وانەی دووەم

### لێی گەڕێن چونکە خۆی فەرمانی پێکراوە

### دَعُوها فَانَّها مَأمُورَة

ئەورۆژەی کە پێغەمبەری خوا هاتە نێو شاری مەدینە خۆشترین ورازاوەترین ڕۆژ بوو لەم



ڕۆژەش دا ناوی نرا بە شاری مەدینـــە چـــونکە بـــەهاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆی روناك بۆوە ناوی لەیثرب گۆڕا بۆ مەدینـەی منەوەرە لەو کاتەی پێغەمبـەر ﷺ لـــــە قوبا بەرێکـــەوت

بـۆ مەدینـە موسـڵمانان زۆر شـادومان بـوون وە ئافرەتـان ومنـاڵان لەسـەر بانـەکان وەسـتابوون شـادومانیان دەردەبـڕی و پیاوەکانیـان دەچـوون بـۆ دەرەوەی شـار بـۆ پێشوازی پێغەمبەر ﷺ وە منالانی تر بە کۆڵانـەکانی مەدینـە دەسورانەوە دەیـان ووت موحەمەد هات موحەمەد هات پێغەمبەر هات

ئەوەی سەرنجی موسڵمانانی ڕاکێشابوو ئەوەبوو ئاخۆ پێغەمبەر ﷺ چ جێگەیەك دەكات بەماڵ وخانووی خۆی وەلەکوێ دادەبەزێ وەشاری مەدینـەش دابـەش کرابـوو بـۆ چـەند گەرەکێکی بچوك وە هەرگەرەکێك هـۆزێکی تیـادا دەژیـان وە هـەرهۆزێك حـەزی دەکـرد پێغەمبەر ﷺ ببێتە میوانی ئەوان وگەورەیی وشـەرەفی میوانـداری پێغەمبـەری خوایـان پێ ببەخشرێ.

وه لەو كاتەی هاتە نێوشاری مەدینە هەموو هۆزەكان وەستابوون لەبەردەم پێغەمبەری خواو سڵاویان لێ كردو داوایان لێ دەكرد كەببێتە میوانی ئەمان ئەویش دەیفەرموو "واز لەم ووشترەم بهێنن چونكە خۆی فەرمان پێكراوە لەكوێ دابەزێ دادەبەزم " وە ئەم پرسیارو وەلامە چەند جارێك دوبارە دەبویەوە پێغەمبەری خواش لەسەر پشتی ووشترەكە دابوو رێشمەی ووشترەكەی بەردابوو خستبوویە سەرملی ووشترەكە خۆی بۆ ئەوەی لەكوێ دابەزێ

وە گەیشتە لای پارچە زەویەك، كەزەوی دوو منالی هەتیو بوون لەنەوەی نەجار ووشترەكەی لەم پارچە زەوی یە یەخ بوو وە دانیشت وە پێغەمبەر ﷺ دابەزی فەرموودەكەی هاتە جێ كە دەیفەرموو (دعوها فانها مأمورة، فَانما انزِلُ حيثُ اُنزلني الله) وە ئەم زەویە لەنزیك ماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری بوو وە خۆی زۆر خۆشحال بوو بەدراوسێ یەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بە پەلە چوو كەل وپەلی لەسەر پشتی ووشترەكە دابەزاندە خوارەوە وداوای لە پێغەمبەر ﷺ كرد بێتە میوانی ئەو وە دابەزینی پێغەمبەر لە هۆزی بەنی نەجار شەرەف وگەورەیی بوو بۆیان وە منالەكانیان شادومان بوون هاتنەلای وسرودیان دەهۆنیەوە دەفیان لێ دەداو دەیان ووت:

نَحنُ جوار من بني النجار یا حبذا محمد من جار

نێمە منالانی نەوەی نەجـــار بـــوین خۆش بەختی بۆ كەسێ موحەمەد دراوسێی بێت

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە نەوەی نەجار ئەوانەی لای دانیشتبوون ئایا منتان خۆش دەوێ؟

ئەوانیش ووتیان ئەرێ وە الله سوێند بەخوا خۆشمان دەوێ ی

وە ئەویش فەرمووی منیش ئێوەم خۆش دەوێ



## [illegible]

**ڕێشمەی ووشتر:** ئەو گوریسەیە کە ملی ووشتر پیێ دەبەستنەوە بەوهۆیە ڕێگا دەگریێ

**فەرمان پێکراوە:** دەچیێ بۆ شوێنی دیاری کراو لەویێ دادەبەزیێ

**بارەکە:** ئەو کەل وپەلەی لەسەر پشتی ووشتر دادەندریێ

**جوار:** منالانی کچانی تازە پێگەیشتوو.

## هەڵسەنگاندن

١ـ موسڵمانان چۆن شادومانیان دەربڕی بەکۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە؟

٢ـ موسڵمانان بە چی سەرقال بوون لەو کاتەی گویێ بیستی هاتنی پێغەمبەر بوون لە قووبا بۆ مەدینە؟

٣ـ هەر ڕستەیەك لەلای ڕاست بگەینە بە ڕستەی لای چەپ لە ستونی یەك بۆ ستونی دووەم

| | |
|---|---|
| موسڵمانان سووربوون لەسەر میوانداری پێغەمبەر ﷺ | منالآن هاتن هۆنراوەیان دەگوتەوە |
| پێغەمبەر (ص) فەرمووی بەوانەی ڕێشمەی وشترەکەیان گرتبوو | بۆ ئەوەی گەورەیی وشەرەفی میوانداری بەدەست بێنن |
| پێغەمبەری خوا ڕێشمەی ووشترەکەی لەسەر ملی ووشترەکەدا نابوو | لێی گەڕێن چۆنی فەرمان پێکراوە وادەکات |
| ئەوەی ئەجار بەهاتنی پێغەمبەر بۆ ناویان | دابەزی لە پارچە زەوی دوو هەتیوی ئەوەی ئەجار |



# وانەی سێیەم

## لەماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری



خانووی ئەبو ئەیوب بریتی بوو لەدوو نهۆم وە پێغەمبەری خوا ﷺ لـەنهۆمی خـوارەوە جـێ نشـین بـوو وە ئـەبو ئـەیوبی ئەنصـاریش لەگـەڵ مـاڵو منداڵەکـەی لـەنهۆمی سـەرەوە بــوون هەرچــەندە زۆر شــپرزەبوون بــە هــۆی ئەوەی ئەوان لەسەرەوە بن پێغەمبەریش لە خوارەوە بێ بـەڵام پێغەمبـەر پێـی خـۆش بوو خۆی لەخوارەوە بێ وئەوان لەسەرەوە بن ئـەبو ئـەیوب وخێزانەکـەی لـە قـوژبنێکی مالەوە نووستن وە کەبـەیانی داهـات چـووە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی ووت وداوای لێکرد کە تەشریفی بێنێ ئەوان بێنـە خـوارەوە بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ رازی نـەبوو لەبەر ئەوەی خەڵك دێن بۆ سەردانی وای پێ باشبوو خۆی لەخوارەوە بێ

وە شەوێك لەشەوەکان گۆزەی ئاوی ئەبو ئەیوب بە دەم داکەوت وئاوی لێ ڕژا وەترسان لەوەی ئاوەکە بەدڵۆپە بێتە خوارەوە بەجل وبەرگی خۆیان ئاوەکـەیان هەڵمـژی نـەبادا پێغەمبەر ئازاری پێبگات وە ئەبو ئەیوب دیسان داوای لێکرد کـە بێتـە نهۆمی سـەرەوە هەتا ڕازی بوو چووە نهۆمی سەرەوە وەهەرچەندە جێنیشینی پێغەمبەر ﷺ لەمالی ئـەبو

ئەیوب بەشێوەیەکی کاتی بوو هەتا ئەو کاتەی خانووی بۆ دروست کرا بەخۆی ومال وخانەوادەکەی چوونە ناویەوە وە، بۆ ماوەی حەوت مانگ بوو ماڵی ئەبوو ئەیوب بووە سەنتەری بەیەگەیشتنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسڵمانان بۆ ڕاوێژکردن بۆ کاروباری خۆیان هەروەکو ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم سەنتەری بانگەوازی ئیسلام بوو لەشاری مەککە هەروەها ماڵی ئەبو ئەیوبیش سەنتەری ئاشکرای دەوڵەتی ئیسلامی نوێ بوو لەشاری مەدینەی منەوەرە.

توانرا ئامانجی بنەمای کۆمەڵگای ئیسلامی لەو ماوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵی ئەبو ئەیوب پەیڕەو بکات وە هەروەها توانی برایەتی لەنێوان کۆچکەران وئەنصاریەکان تەواو بکات بۆ پەیداکردنی پەیوەندی نوێ لەنێوان خەلکەکاندا کەدامەزرێ لەسەر بناغەی ئیمانو باوەڕ بوون نەك لەسەر بناغەی هۆزایەتی ورەچەلەك توانرا بناغەی مزگەوت تەواو بکات وە لە تەنیشتیەوە خانوویەك دروست بکات تیایدا جێنشین بێت وە هەروەها بەڵێن نامەی نووسی کەناسراوە بە بەلێن نامەی مەدینە (وثيقة المدينة) کە بەهۆیەوە ماف وپێداویستیەکان دیاری بکات بۆ خەلکانی شاری مەدینە لە قۆناغی داهاتوو دا کە خۆی لە دەولەتی ئیسلامی لە مەدینەدا دەبینێتەوە

## سودێك

ئەبو ئەیوبی ئەنصاری: لەسالی پەنجاو دووی کۆچی وەفاتی کرد کەوا جەنگاوەر بوو لەسوپای ئیسلامدا کە ئابلۆقەی شاری (القسطنطينية) ئەستەنبولی ئێستایان دا، وە پیرێکی بەسالاچوو بوو ئەم پیریە وای لێ نەکرد بەشداری جەنگ نەکات وەهەتا ئێستاش گۆری پیرۆزی لەم شارەیە.



## هەڵسەنگاندن

١- لەبەرچی خانەوادەکەی ئەبو ئەیوب هەستیان بە نیگەرانی کرد لەخەوتن لەنهۆمی سەرەوەی خانوەکەیان ؟

٢- بۆچی پێغەمبەر نهۆمی خوارەوەی هەڵبژارد لەماڵی ئەبو ئەیوب؟

٣- بۆ شایی ئەم دوو رستەی خوارەوە پڕبکەرەوە؟

أـ ماڵی ئەرقەم لە مەککە سەنتەری ..............بوو

ب ـ ماڵی ئەبو ئەیوب سەنتەرێکی ئاشکرابوو بۆ ..................

٤- ئامرازی (√) بەرامبەر ڕستەی راست وئامرازی چەوت (×) بەرامبەر ڕستەی هەڵە دابنێ.

أـ برایەتی نێوان کۆچکەران وئەنصارییەکان لەسەر بناغەی بروا بوون دامەزرابوو(   ).

ب ـ مزگەوتی قوبا دروست کراو پێغەمبەریش لەماڵی ئەبو ئەیوب بوو(   ).

ج ـ پەیمان نامەی مەدینە دیاری کردنی پەیوەندی بوو لەنێوان موسلمانان وقورەیش(   ).

د ـ مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینە دروست کراو پێغەمبەریش لەماڵی ئەبو ئەیوب بوو(   ).

## وانەی چواردەم

### بناغەی دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەر



پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەو کاتەی گەیشتە شاری مەدینەی منەوەرە هەوڵی دروست کردنی بەردی بناغەو کۆڵەگەی دەوڵەتی ئیسلامی بنیات بنێ، وە ئەو کۆڵەگەش دروست کردنی مزگەوت بوو لە شاری مەدینە.

وە پێغەمبەر ئەو زەویەی هەڵبژارد کەوا ووشترەکەی لەوێ دا یەخ بوو، وە ئەو زەویە هی دوو منداڵی هەتیوو بوو لە نەوەی نەجار وە پێغەمبەر ﷺ بانگی سەر پەرشتیاری هەردوو هەتیوەکەی کرد داوای لێ کردن کە ئەو پارچە زەویە یان پێ بفرۆشێ بۆ دروست کردنی مزگەوت لەم شوێنەدا ، وە ئەوانیش ووتیان ئێمە بە خۆڕایی لە پێناوی

خوا ئەت دەینێ وە نرخی وەرناگرین، وە ئەویش رەتی کردەوە بە بێ نرخ وەری گرێ، وە پارەی پارچە زەویەکەی دا بە دوو منداڵە هەتیوەکە وە دەست کرا بە دروست کردنی مزگەوت بە خاوێنکردنەوەی زەوی وقوڵکردنی ودیوار دروست کردن بەخشت لەقوڕ دروست کراو وە خۆی هاوبەشی لەدروستکردنی مزگەوت کرد وە لەگەڵ هاوەڵانی بەشدار بوو وە ئەم دێرە شیعرەی دەگووتەوە:

اللّهم لاعَيشَ الاّ عَيشَ الآخِرَة　　فَاغفِر للانصار وَالمهاجِرَة

خوایە ژیان تەنها ژیـــانی دوا ڕۆژە　　وە لەکۆچکەران وئەنصاریان خۆش بە

وە هاوبەشی خۆی لەمزگەوت دا هاندەرێك بوو بۆ هاوەڵان وەبەدەم گووتنی ئەم دێرە شیعرانە کاریان دەکرد

لَئِن قعَدنا وَ النَبي يعمَل　　لذاكَ مِنا العَمَلُ المضَلَل

ئێمە دانیشین و پێغەمبەریش کاربکات　　ئەوە بۆ ئێمە کارێکی گومراکارانەیە

مزگەوتەکە چوارگۆشەبوو درێژی سەد باڵ و پانیش سەدباڵ بوو وەدروست کرا لەشێوەی خانووی خەلکی مەدینەدا لەخشتی سورکراوە لەخۆل دروست کرابوو وە کۆلەگەی لەداری خورما بوو وە سەربانەکەی لە گەلای دارخورما بوو وە ڕووگەی (قیبلە)ی بەرەو(بەیتوول مەقدیس)بوو هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە ڕووگەی موسڵمانانی گۆڕی لە قودسەوە بۆ کەعبەی پیرۆز وە خانوویان لەتەنیشیت مز گەوتەکەوە بۆ پێغەمبەرﷺدروست کرد لەپاش ئەوەی لە ماڵی ئەبو ئەیوب بوو گواستیەوە بۆ ماڵی خۆی، وە دروست کردنی مزگەوت هەنگاوێکی گەورە وسەنگین بوو، چونکە مزگەوت لەنێوان موسلمانان شوێنێکی تایبەت بـۆ نوێـژ وبـەجێ گەیانـدنی ئـەرکی سـەر شـانی موسـلمانان وپێشـوازی کردنـی وەفـدەکان بانگـەوازی ئیسـلامی وفێرکردنـی کاروبـاری ئـاینی

وڕێکخستنی سوپاو مەشقکردنیان بۆ جیهاد وجەنگ لەپێناوی خودا، وە دەوروودەرسی قورئان و وەببوە بارەگا وڕاوێژکردنی پێغەمبەر بە مووسلمانان، وە هەروەها شوێنی حەوانەوەی موسلمانە کۆچکردووە بێ نەواکانن وە مزگەوتی پێغەمبەرلە مەدینە بە درێژایی مێژووی ئیسلامی ببوە سەنتەری روناکبیری بۆ هەموو لایەك لە لایەنەکانی ژیان وە هەرلەوێ چەندەها زانا وکەلەپیاوی بەرز بەدرێژایی مێژوو پەروەردەبوون ولەوێ دەرچوون وەتا دونیا مابێ چەندها کەلەپیاوی زانا کە لە ئایندە دالەم مزگەوتە دەردەچن بۆ خزمەتی ئیسلام وموسڵمانان وەتا ئێستاش ئەلقەی وانە ووتنەوەی تێدا بەردەوامە.



## سوودێك

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی ژیانی موسڵمانان فراوان وگەورە کراو چەند جارێك لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین وەتاکو ئەم چەرخەی ئێمە تێیدااین فراوان کراوە وخزمەتی باشی بۆ کراوە وە بۆ ئەوەی جێگای ئەم هەموو خەلکە بێتەوە کەوا لە هەموو جیهان رووی تێ دەکەن وسەردانی دەکەن وە ئەم فراوان بوون وگەورەبوونە وای لێ هاتووە بە قەد شاری مەدینەی کاتی پێغەمبەری لێ هاتووە.

## هەڵسەنگاندن

١ لە چ شوێنێك مزگەوتی پێغەمبەر بنیات نرا ؟

٢ هەستی موسلمانان چی بوو لەوکاتەی کە بینیان کە پێغەمبەر ﷺ خۆی هاوبەشی دروست کردنی مزگەوتی کرد ؟

٣ چەماوە بکێشە بەدەوری وەڵامی راست.

أ- پێغەمبەر بە نەوەی نەجاری ووت کەوا ئەو شوێنەی ووشترەکەی لێ دابەزی دەیکاتە مزگەوت.

١-زەویەکەیان بەخشی بە پێغەمبەر.

٢- رازی نەبوون بیفرۆشن.

٣- لێ یانی کڕی وپارەکەی پێ بەخشین.

ب - لە سەردەمی پێغەمبەر مزگەوتی پێغەمبەر دروست کرا لە.

١ - خشت وداری دارخورما.

٢- بەرد

٣- دار

٤ نیشانەی راست (√) بەرامبەر وەلامی ڕاست دابنێ وە نیشانەی چەوت(×) بەرامبەر وەلامی چەوت دابنێ.

أ - مزگەوت لە ئیسلامدا بەس بۆ نووێژکردن بوو ( )

ب - پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لە وەفدەکان دەکرد لە مالەوەدا( )

ج - هەژارو بێ نەوایان جگە لە خەلکی مەدینە لە مزگەوت دەنووستن ( )

د - مزگەوتی پێغەمبەر بە درێژایی سەدە لە زانکۆیەك دەچوو ( )

## وانەی پێنجەم

### برایەتی نێوان کۆچکەران وئەنصاریان



کۆچکەران ماڵ وسامان ونیشتمانی خۆیان جێ هێشت، بەرەو نیشتیمانێکی تازە هاتن وبرا بەرێزەکانیان پێشوازییێکی گەرم وگوڕیان لێ کردن برایەتی وئیمان وبڕوا کۆیانی کردنەوە، پێغەمبەر ﷺ ویستی کارێکی بەپەلە بکات بۆ مسۆگەرکردنی ژیانێکی ئاسودە بۆ برا کۆچکردووەکانی مەککە، ئەویش هەڵسا بە برایەتی کردنی لە نێوان برا کۆچکردوەکان وئەنصاریەکان، ئەوەبوو برا ئەنصاریەکان ئەوەیان خستەڕوو کە دەبێ ئێمە ماڵ وسامانمان دابەش بکەین بەسەر برا کۆچکردووەکان ، لەزەوی وزارو دارخورما وپارەو پوول بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە رازی نەبوو بەس فەرمانی کرد بەس لە بەروو بوم هاوبەش بن وموڵك وسامان هی خۆتان بێت، وە بەخشەندەی سەعدی کوری رەبیعە گەیشتە ئەوەندە کە ماڵ وسامانی هەموو بکاتە نیوە بۆ عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف بەڵام عەبدولرەحمان ئەو بەخشندەی سەعدی بەلاوە ناوازە بوو فەرمووی ئەی

برام خـوا بەرەكـەت بكاتـە مـالّ ومنـال وسـامانت بـەس بـازارم پـیّ نیشـان بـدە، بـەلّام كۆچـكـەران بەئەنـدازەی پێویسـتی خۆیـان سـامانی بـرا ئەنصـاریەكانیان وەرگـرت، وە لەسەر ئەم خێرو صەدەقەی كە ئەنصـاریەكان ئـەنجامیان دا، بـرا كۆچـكەران گومانیـان وابوو كە ئەنصاریەكان خێرو چاكەیان زۆر كردوە ئەوانیش بیّ دەرامەتن وهـەژارن بـەلّام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی روون كردنەوە كەوا دوعا وپاڕانەوە وسوپاس گوزاری ئێوە بـۆ ئەنصاریەكان وای كردوە كە ببنە هاوبەشی ئێوە لە ئەجرو پاداشتی دا.

وە برایـەتی خسـتە نێـو كۆچـكەران وئەنصـاریەكان بناغەیـەك بـوو لەسـەر بناغـەكانی كۆمەڵگـەی ئیسـلامی هاوچـەرخ لـە مەدینـەی منـەوەرە بـۆ پتـەوكردن وراگرتنـی لـەنێو خەلكدا، ئەمەش لەپەیوەندی ئیمانی یە وە ببونە میراتگری یەكدی لـەنێوان كۆچـكەران وئەنصاریان ئەمەش حالەتێكی لەناكاو بوو بۆ بەرگە گرتنی ئەو هەلّ ومەرجەبووكە هاتە پێشەوە لە كۆچـكردنی موسلمانە كۆچـكردووەكانی مەككە بـۆ شـاری مەدینـە وە لـەو كاتەی كە كۆچكەران گەیشتن بە كارو كاسبی خۆیـان ئـەم پەیوەنـدی یـە مـیرات گریـە كۆتایی هات.

وە ئەم ئایەتە دابەزی كە دەفەرمویّ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ مَعَكُمۡ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُو۟لُوا۟ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌۢ ﴾ انفال ٧٥.

واتـە: (لـەئێوەن (پلـەی ئێوەیـان هەیـە) ئەوانـەش كـە سـەرەڕای پەیوەنـدی ئیمـانی پەیوەنـدی خزمایەتیشـیان هەیـە، هەنـدێكیان شایسـتەترن بـە هەنـدێكی تریانـەوە لـە بەرنامەی خودادا (واتە ئەوان شایستە تـرن لـەمیرات بەریـدا بۆیـەكتری))، بەراسـتی خـوا بەهەموو شتێك زانا وئاگایە). تەفسیری ئاسان ل١٨٦



## هەڵسەنگاندن

١ لەبەرچی پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان کۆچکردوان وئەنصاریەکان ؟

٢ باسی هەلوێستی سەعدی کوڕی ڕەبیعە بکە لەگەڵ براکەی عەبدولرەحمانی کوری عەوف ؟

٣ نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ ؟

أ - ئەنصاریەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە زەوی ودارخورما دابەش بکەن لەگەڵ کۆچکردووەکان.

ب - کۆچکردووەکان سکالای کەم وکورتی وکەمتەرخەمی ئەنصاریەکانیان کرد.

ج - کۆچکردووەکان هەستیان کرد کەوا ئەنصاریەکان بە پلەی ئەجرو پاداشتی زۆر گەیشتن.

د - مافی میرات گری لەنێوان کۆچکەران وئەنصاریان بەردەوام بوو.

ه - مافی میرات گری نێوان کۆچکەران وئەنصاریان کۆتایی هات پاش نەمانی پێویستی کۆچکەران.

# وانەی شەشەم

## دانیشتوانی مەدینەی منەورە



لەنێو شاری مەدینەی منەوەرە لـە پـێش ئیسـلام دا دوو هـۆز هـەبوون کـە ئـەوس وخـەزرەج بـوون وە پەیوەنـدی نێوانیـان بریتـی بـوو لەشـەڕو کوشـتار وناخۆشی، وە چـەندەها سالّ بـوو دوژمنکـاری لـەنێوانیان پەرپا بوو.

وە کۆمەلێکی تر لە مەدینە دەژیان کـە ئـەوانیش جولەکـە بـوون وە چاوەنواڕی هـاتنی پێغەمبەری ئاخیر زەمان بوون،

وە باش ئەیانزانی کەبێ سێ ودوو هەر ئەو پێغەمبەرە دەبێت پەیدابیێت لـە حیجـاز دا، وە جوولەکەکان سیاسەتی لێك جوداکردنیان پـەیڕەو دەکـرد(السیاسـة التفریـق)لـەنێوان ئەوس وخەزرەج دا وەلەپاش ئەوەی ئاینی ئیسلام لەشاری مەدینە بـلاوەی کـرد وپـاش ئەوەی پەیمانی عەقەبەی یەکەم ودووەم، وە هاتنی موصعەبی کوڕی عومـەیر دەورێکـی بالای هـەبوو لـە بلاوبونـەوەی ئـاینی ئیسـلام لـە شـاری مەدینـە کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ناردی بۆ شاری مەدینە بۆ بانگەوازی ئیسلام وفێری قورئان خوێندنی کردن وە هـیچ

مالێك نەما لەشاری مەدینە ئیسلامی تـێ نەچووبێ ، لەپاشـان موسـلمانان پـەیتا پـەیتا کۆچیان دەکرد لە مەککە بۆ مەینەی منەوەرە پێش کۆچی پێغەمبەر بۆی بـەڵام لەگـەڵ ئەوەش دا دانیشتوانی مەدینە هەر هەموویان موسلمان نەبوون بەڵکو جولەکە وموسڵمان وموشریکی تێدابوو.

وە هەر لەناو ئەوس خەزرەج دا کۆمەڵێك مابوون کـە موسـلمان نـەبوو بـوون لەسـەر بـێ بڕوایی مانەوە لەسەر بت پەرستی گۆش کرابوون، وە بەئاسانی نەدەکرا موسڵمان بن وە دەبوایە کاتێکی باشی بۆ تەرخان بکرایە بـۆ موسـلمان بوونیـان، جوولەکـەکان لـەپاش ئەوەی شارەزای خوورەوشتی موسلمانان بوون دژایەتی خۆیـان بـۆ موسـلمانان ئاشـکرا کرد وە دەیان زانی ئەو سەروەری یە وپلەی کە لەپێش ئیسـلامەتی هـەیان بـوون لێیـان سەنرایەوەو وە لەبەرامبـەردا کۆمـەڵێ لـەبت پەرسـتان بریاریـان دا دوژمنایـەتی ئیسـلام بکەن چونکە ئیسـلام ترسـناك بـوو بـۆ بەرژەوەنـدی ئـەوان وە سـەرکردایەتی لەمەدینـە لەدەستیان دەرچوو وە زانیان کۆچکەران پێشبرکێیان دەکرد لە مەدینـەدا وە ئـەوانیش نەیان توانی بەئاشکرا دوژمنایەتی ئیسلام بکەن وە ئیسلامەتی خۆیـان ئاشـکرا دەکـرد وبەنهێنی کافرو بێ بڕوابوون، وە بە نهێنی لەگەڵ بـرا هاوپەیمانـەکانیان دابـوون لـەدژی ئیسلام وە ئەم کۆمەلە ناونرابوون بە دوو ڕووەکان (المنافقین) وەگەورەکەیان عەبدوللای کوری ئوبەی کوری سەلول بوو.

وە لەلایەکی ترەوە کۆمەلێ جولەکە لە مەدینە دەژیان کە وازیان لـە کشـتوکال هێنـابوو سەرقالی بازرگانی بوون، وە زۆر دەولەمەنـد بـوون وە بازاریـان لـە دەسـت خۆیـان بـوو، وەقەرزیان دەدا بە خەڵکی بە ڕیبا وسود بۆ ئەوەی خۆیان بسەپێنن بەسەر خەڵکیدا .

وە جولەکـەکان لەسـەرەتاوە پێشـوازیان لـە ئـاینی ئیسـلام نـەکرد وە ڕازی نـەبوون پێغەمبەری کۆتا زەمان لەعەرەبەکان بێت بەئاشکرا دژایەتیان دەکرد، وەرازیش نەبوون کە هۆزی ئەوس وخەزرەج هاتوونە ناو ئیسلام وە لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام پەیمانیان بەست وەچەندە شەڕ وجەنگ لەنێوان خۆیان وئیسلام ڕویدا تا بەتەواوی وکۆتایی لەشاری مەدینە دەرکران بۆ هەتا هەتایی.

## هەڵسەنگاندن

١ پەیوەندی نێوان ئەوس وخەزرەج چۆن بوو ؟

٢ ئەو دەورە چی بوو کە موصعەبی کوڕی عومەیر لە مەدینە گێڕای ؟

٣ نیشانەی ڕاست (√) بەرامبەر ڕستەی ڕاست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ ـ دانیشتوانی مەدینە لەکاتی کۆچی پێغەمبەر هەموویان موسلمان بوون(    ).

ب ـ دووڕوەکان ئیسلامیان ئاشکرا کرد کوفرو بێ بروایان شاردەوە(    ).

ج ـ جولەکەکان وایان دانابوو کە پێغەمبەری ئاخیر زەمان لەخۆیان بێت(    ).

د ـ جولەکەکان بێ لایەنی خۆیان نیشاندا لەبەرامبەر ئیسلام(    ).

هـ ـ جولەکەکان پێش ئاینی ئیسلام فیتنە وئاشوبیان بەرپا کرد لەنێوان ئەوس و خەزرەج دا (    ).



## وانەی حەوتەم

# دووڕووەکان ( المنافقون ) لە مەدینەدا



لە شاری مەدینە پیاوێ هەبوو ناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو کە هۆزی ئەوس وخەزرەج بڕیاریاندابوو وە یەك دەنگبوون لەسەر ئەوەی بیکەن بەپادشای خۆیان لە پێش ئیسلام لەشاری مەدینەدا، بەڵام کە دەولەتی ئیسلامی بەرپا بوو وە دامەزرا وخەلکەکە پەیمانیان دایە پێغەمبەری خوا ئەو هەلەیان بۆ نەرەخسا وە نەیان توانی بیکەنە پاشا.

وە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی داخ لەدڵ بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، وای گومان برد کە پێغەمبەر بووە هۆی لێ سەندنەوەی دەسەلاتی پاشایەتی لەو، وە نەیتوانی بەئاشکرا دوژمنایەتی لەگەڵ ئیسلام بکات بەڵکو هەڵسا بەدانانی پیلان وتەلەکە وفێل

وەشاردنەوەی کووفر وبێ بڕوای وە ئاشکرا کردنی ئیسلام بە سەر زارەکی وە پەیمانی بەست لەگەڵ بت پەرستانی قورەیش وجولەکە وە لەدەوری خۆی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کۆکردەوە کەوا قورئانی پیرۆز ناوی بردوون بەدوڕوەکان (المنافقون) وە لەقورئانی پیرۆزدا سوورەتێك دابەزی بەناوی ئەوانەوە کەوا درۆ وفێڵی ئەوانی ئاشکراکرد وە ڕوونی کردەوە کەوا ئیمانو بڕوایان بەسەر زارەکی هێناوە وڕەتی دەکەنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات وە نەهی دەکەن لە ماڵ سەرف کردن بۆ هەژارانی موسلمانان وە پاش گەڕبوونەوە لە دەم درێژی لەنێوان خۆیان.

وە دووڕووەکان هەوڵیان دا بۆ بلاوکردنەوەی و وورە داروخانی موسڵمانان بە هۆی بەشداری کردنیان لە جەنگەکاندا لەپاشان لەگەرمەی جەنگدا پاشەکشەیان دەکرد ودەگەڕانەوە ئەوە بوو لە جەنگی ئوحود بەشداریان کردو پێش دەستپێکردنی جەنگ گەڕانەوە دواوە.

وەقورئانی پیرۆز لەسورەتی (التوبە) باسی مونافیق ودووڕووەکانی تۆمار کردوە لە جەنگی تەبوك کەوا زۆربەیان پاشەکشەیان کرد ونەهاتن بۆ جەنگ وە هەڵسان بە هێنانەوەی چەند بەڵگە وبەهانەی بێ سەروبەر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە گومانیان دەخستە دڵی موسڵمانە بەخشەرەکان کەوا یارمەتیو کۆمەکیان دەکرد بوجەنگی تەبووك وە هەروەها دوو ڕووەکان نەدەهاتن بۆ نوێژ ومەگەر بەتەمەڵی دەیان کرد وە ماڵیان سەرف نە دەکرد لەپێناوی خوا مەگەر بەزۆری زەبر نەبێت وە یادی خوا ناکەن تەنیا بەکەمی نەبێت.

وە هەندێك لەدووڕوان دەرچوون بۆ جەنگی تەبوك وە پیلانێكیان بە دەستەوەبوو بۆ كوشتنی پێغەمبەر لەو كاتەی كە دەگەڕایەوە بۆ شاری مەدینە وە خوای گەورە پیلانەكەی ئەوانی ئاشكراكردوو پێغەمبەری رزگار كرد لە دەستی ئەم ناپاكانە.

وە دووڕوەكان بەمەوە نەوەستان بەڵكو هەڵسان بەدروست كردنی مزگەوتێك لەقوبا بۆ كۆبونەوە وپیلان دارشتن لەم مزگەوتە، وە بیكەنە پەردەپۆشی خۆیان وە ئەمەش پێش جەنگی تەبوك بوو، وە بە پێغەمبەری خوایان گوت ﷺ ئێمە مزگەوتمان دروست كردوە بۆ نوێژ وخواپەرستی وە بۆ ڕێبواران تیایدا، وە حەزدەكەین تۆش بێیتە ناو مزگەوتەكە ونوێژی تیادا بكەی بۆ ئەوەی ناوی مزگەوتی بكەوێتە سەر، وە پێغەمبەری خوا لەسەرەتادا بەڵێنی پێدان لەكاتی گەڕانەوەی لە تەبوك بێتە ناو مزگەوتەكە، بەڵام خوای گەورە نیازی گڵاوی ئەوانی بۆ پێغەمبەر ئاشكرا كردوو وە پێغەمبەری خوا لە پاش گەڕانەوەی لە جەنگی تەبوك دووپیاوی نارد بۆ سوتانی وروخاندنی مزگەوتەكە وە خوای گەورەش ئەم هەواڵەی لە قورئانی پیرۆز تۆمار كردووە كە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ ۖ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١٠٧) لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ (١٠٨)﴾ التوبه ١٠٧ ـ ١٠٨.

واتە: ﴿ ئەو (دووڕوانەی) كە مزگەوتێكیان دروستكرد لەبەر زەرەر دان وبلاوكردنەوەی بێ باوەڕی ودووبەرەكی بەرپاكردن لەنێوان ئیمانداران وە بۆ چاوەڕوانكردنی هاتنی ئەو كەسانەی كە پێشتر دوژمنایەتی وجەنگیان دژی خواو پێغەمبەرەكەی دەكرد وبێگومان

سوێند دەخۆن کە ئێمە تەنها مەبەستمان چاکە بووە، لەکاتێکدا خوایش شایەتی دەدات کە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن ﴿١٠٧﴾ هەرگیز لەو مزگەوتە ڕامەوەستە بۆ نوێژکردن چونکە بەڕاستی مزگەوتێك شایستەیە کە تۆ تیایدا بوەستیت بۆ نوێژ کردن کە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە لە سەر بنچینەی تەقواو خواناسی دروستکراوە، چونکە لەم مزگەوتە چەند کەسانێکی مەردی تیادایە کە زۆر حەزدەکەن خۆیان خاوێن رابگرن لەدەروون ورواڵەتدا خوایش بەردەوام ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك ڕادەگرن ﴿١٠٨﴾﴾ (تەفسیری ئاسان ل ٢٠٤) دووڕوەکان مەترسی گەورەبوون لەسەر ئاینی ئیسلام، چونکە دوژمنایەتی ژێر بە ژێری لەنێوان خۆیان وئیمانداران دابوو وە لەنێو موسلمانان دەژیان، بەڵام خوای گەورە موسولمانانی لەخراپە وناپاکی ئەوان پاراست، وەپێغەمبەری خوا هەلسوکەوتی بە دانایی لێزانی بوو لەگەلیان بە ئومێدی ئەوەی بروا بهێنن وبگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئیسلام وتەوبە بکەن وە هەندێکیان لەسەر کوفر وبێ بڕوای مانەوە وهەندێکیان تەوبەیان کرد وپەشیمان بوونەوە.

## هەڵسەنگاندن

١ هۆی پەیدابوونی دووڕووەکان لە مەدینە چی بوو ؟

٢ روونی بکەوە دەوری دووڕووەکان چی بوو لە جەنگی ئوحوددا ؟

٣ دووڕووەکان پیلانێکیان دژی پێغەمبەر دامەزراندلە جەنگی تەبووك روونی بکەوە ؟

٤ نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ ـ دووڕووەکان دوژمنایەتیان ئاشکرا کرد بەرامبەر موسلمانان

ب ـ دووڕووەکان بەلگەو بەهانەیان دروستکرد بۆ ئەوەی لە جەنگی ئوحوددا دوا بکەون وپاشەکشە بکەن.

ج ـ دووڕووەکان بەگومان بوون لەوانەی کۆمەکی جەنگی تەبوکیان دەکرد.

د ـ دووڕووەکان زۆر یادی خوایان دەکرد.

٤ چەماوە بکێشە لەدەوری وەلآمی راست لەمانەی خوارەوە.

أ ـ لەو کاتەی ئەبو عامر داوای لە دووڕووەکان کرد مزگەوت دروست بکەن

١ ـ ترسان لە ئاشکرا بوونی پیلانەکەیان وە مزگەوتیان دروست نەکرد

٢ ـ مزگەوتیان دروست کردو بوو بە بارەگای خۆیان بۆ پیلان دانان.

٣ ـ دروستیان کرد وداوایان لەپێغەمبەر کرد نوێژی تێدا بکات.

ب ـ لەو کاتەی پێغەمبەر لە جەنگی تەبووك گەڕایەوە.

١ ـ نوێژی لەو مزگەوتە کرد کە دووڕوەکان دروستیان کرد.

٢ ـ نوێژی تیادا نەکرد وە چاوپۆشی لێ کردن ونوێژیان تیادا دەکرد

٣ ـ فەرمانی دا بەڕوخان وسوتاندنی.

ج ـ پێغەمبەر ڕوبەرووی دووڕوەکان ببۆوە.

١ ـ فەرمانی دا بەکوشتنیان.

٢ ـ مامەڵەی جوانی لە گەڵدا کردن تاکو موسڵمان بن

٣ ـفەرمانی دابەبێ گوێپێدان وفەرامۆش کردنیان.

## وانەی هەشتەم

# جولەکەکان لە مەدینەدا



لە شاری مەدینە سێ کۆمەل لە جولەکە هەبوون کە ئەوانیش جولەکەی بەنو نەزیر وبەنو قوورەیزە وبەنو قونەیقاع بوون، وە موسلمانان چاوەنوارپوون کە جولەکە یەکەم تاقم بونایە کە بڕوایان بە پێغەمبەر کردبایە وببونایە موسلمان چونکە دەیان زانی بەم نزیکانە پێغەمبەری ئاخیر زەمان پەیدا دەبێ لە شاری مەککە وە خوای گەورە عەهدو پەیمانی لێوەرگرتن لە کۆندا کە دەبێ بڕوای پێ بهێنن وموسلمان بن، وە خۆیان ئەم گوفتارانەیان بە هۆزی ئەوس وخەزرەج دەگوت لە مەدینەدا.

لەپاش ئەوەی پێغەمبەری خوا بانگەوازی ئیسلامی بۆ شاری مەدینە ڕاگەیاند و وەفدی مەدینەیی هاتن بۆ مەککە لە وەرزی حەج زانیان ئەوا ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان باسی لێوە دەکەن وبڕوایان پێ هێنا.

وە لـەو کاتـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کۆچـی کـرد بـۆ شـاری مەدینـە فـەرمانی دا بـە نوسینەوەی (بەڵێن نامەی مەدینە) کە تیایدا هەموو مافێك پارێزراو بێت بۆ دانیشتوانی مەدینە لە موسلمانان وجولەکە وە وازی لـە جولەکـە هێنـا کـە لەسـەر دینـی خۆیـان بـن هەروەها ماڵ وسامانیان بۆ خۆیـان بـێ وە هاووپـەیمانی موسـلمانان بـن لـە مەدینـە بـۆ بەرگری کردن لە هەر هێرشێك کە بکرێتە سەر شاری مەدینە لە هەر لایەکەوەبێت ئـەوان شان بەشانی موسڵمانان پارێزگاری لێ بکەن.

وە زاناکانی جولەکە دەهاتنە لای پێغەمبەر ولەلای دادەنیشتن وبۆ زانینی راستی پەیامی ئیسـلام ئـەو مزگێنیانـەی کـە لـەقورئان دا هـاتووە بـۆ بـەنی ئیسـرائیل ونیشـانەکانی پێغەمبەرایـەتی موحەمـەد ﷺ وە هەنـدێکیان هەلسـان بـە نانـەوەی بـەد گومـانی بـۆ موسلمانان پرسیاری بێ سەرو بـەریان دادەنـا لـە پێغەمبـەریان دەکـرد وە هەندێدکیان لەبەر لووت زلی وفیز وخۆبەزلزانی وحەسـودی نەدەهاتنـە نـاو ئـاینی ئیسـلام وە دەیـان ووت چۆن ئیمان بە پێغەمبەرێك بهێنین کە لەوان نـی یـە وبۆچـی لـە عـەرەب پێغەمبـەر هاتووە؟

دایکی ئیمانداران صەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختـەب هەڵوێسـتی بـاوکی (حویـەی) بەرامبەر مامی بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ:

مامی صەفیە ووتی: ئایا ئەو پێغەمبەرەیە کە وەسف وناوی لە تەورات هاتووە؟

حویەی: بەلێ ئەوە ڕاستە.

مامی: هەلویستت چی بوو؟

حویەی: سوێند بەخوا تا لەژیاندا مابم دوژمنایەتی دەکەم

وە صەفیە زانی کەوا پێغەمبەر ڕاستەو لەپاشان خـوا ڕێـزی لـێ گـرت بـەهۆی موسـڵمان بـوونی وە بوووبـە خێزانـی پێغەمبـەر و پـاش جـەنگی خەیبـەر، وە بـوو بـە دایکـی ئیمانداران رضي الله عنها وە هەڵوێستی جولەکە ڕوون بۆوە لـەو کاتـەی عەبـدوللای کـوری سـەلام موسڵمان بوو کە یەکێك بوو لەزانایانی جولەکە لەشاری مەدینە وەعەبدوللا گەیشت بـە

پێغەمبەر وگوێ ی لێ گرت وبڕوای هێنا هەر لەوکاتەی کە پێغەمبەر هاتە نێو شاری مەدینە. وە ویستی موسڵمان بوونی خۆی بکاتە بەڵگە وبەهانە بۆ جولەکەکان، بۆیە داوای لە پێغەمبەر کرد کە خۆی بشارێتەوە وئەویش بانگی زانایانی تری جولەکە بکات پێش ئەوەی ئەوان بزانن کە عەبدوللا موسڵمان بوو پرسیاریان لێ بکات دەربارەی عەبدوللای کوری سەلام کە لەلای ئەوان چۆنە؟ وەئەویش وای کرد وبەزانایانی جولەکەی فەرموو ئایا عەبدوللا لەلای ئێوە چۆنە؟ ئەوانیش وتیان بەرێزە وگەورەیە باسی چاکی جوامێری ئەویان کرد وە لەم کاتەدا عەبدوللا هاتە دەرەوە ئیعلانی ئیسلامەتی کرد وشادەی هێنا وە پێیانی فەرموو ئێوە دەزانن کەوا موحەمەد پێغەمبەری خوایە کەوا ئێمە چاوەنواڕی بووین دەی زووکەن بڕوای پێ بهێنن.

وە کە جولەکەکان وایان دیت لە عەبدوللا کەوتنە قسە پێ وتن وجوێن پێدانی وە بەوەوە نەوەستان بەلکو پێغەمبەریان بەدرۆ خستەوەو پەیمانیان شکاند وە هەلسان بە نانەوەی فیتنە وئاشوب لە دڵی موسلمانان وهۆنینەوەی شیعر وهۆنراوە کە لەکاتی خۆی لەنێوان ئەوس وخەزرەج دەیان گوتەوە.

وە هەڵسان بە بلاوکردن وئاشکرا کردنو عەیب لابردنی ئافرەتی موسلمانێ لە بازاری بەنو قونەیقاع وە کوشتنی موسلمانێ کە وویستی ئەم ئافرەتە ڕزگار بکات وە بەنونەزیر هەڵسان بە پیلانێك بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی لە لایان دانیشتبوو وە پەیمانی بەستن لەگەل بت پەرستانی مەککە لە رۆژی جەنگی خەندەق وە بوونە هۆی هێنانی ئەم سوپا زۆرەی قورەیشیانو غەتەفان وجولەکە بۆ سەر شاری مەدینە وەئەم هەموو کارە ناپاکانەی ئەوان بووە هۆی موسلمان شەڕ لەگەڵ جوولەکە بکات وە لە ئەنجامدا بەدەرکردنیو رۆیشتنی جولەکە لە مەدینە دوایی هات.

## هەڵسەنگاندن

١ بۆچی دەبوایە جولەکە یەکەم کەس بوونایە کە بڕوای بە پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنن ؟

٢ روونی بکەوە چۆن پێغەمبەر لەو کاتەی کۆچی بۆ مەدینە کرد هەلسوکەوتی چۆن بوو لەگەل جولەکە ؟

٣ باسی چیرۆکی موسلمان بوونی عەبدولای کوری سەلام بکە ؟

٤ ئەم بۆشاییانە پڕبکەوە .

أ - زانایانی جولەکە لە لای پێغەمبەر ﷺ دادەنیشتن بۆ زانینی نیشانەی ..............

ب - هەلویستی حویەی کوری ئەختەب دوژمنایەتی .............. بوو.

ج - لە منالی یەو صەفیە دەیزانی کە موحەمەد .............. خوایە.

٤ نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ - جولەکەکان پەیمانیان بەست لەگەل دووروەکان.

ب - جولەکەکان ویستیان پێغەمبەر بکوژن.

ج - جولەکەکان شەڕیان لەدژی قورەیش دەکرد لەگەڵ موسلمانان.

د - جولەکەکان هەولی نانەوەی فیتنە بوون لەنێوان موسلمانان.

## وانەی نۆیەم

# پەڕاوی بەڵێن نامەی مەدینە



کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ سەرەتایەك بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە، وە ئەوس وخەزرەج موسولمان بوون وە پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرێتی و جیهاد وتێکۆشان لەپێناوی خوا، وە پێغەمبەر خاوەنی فەرمان ونەهی بوو لە مەدینەی منەوەرەدا.

وە شاری مەدینە پێك هاتبوو لە کۆمەڵگەی موسڵمانی تازە پێگەیشتوو کە تا ئێستا عەرەبەکان شتی وایان نەبینیبوو چونکە عەرەبەکانی پێش ئیسلام بریتی بوون لە چەند هۆزێکی جیا کە تەنها بازرگانی وبەرژەوەندی دونیا کۆی کردبوونەوە، بەڵام کۆمەڵگەی نوێ لەسەر بناغەی ئیسلام گۆشکرابوون وەئەوانەی کۆچیان کردبوو بۆ مەدینەوە براکانیان لەشاری مەدینە وەریان گرتنەوە ودڵدەیان دان ودڵ وماڵیان بۆ کردنەوە وە کردنیان بە هاوبەشی ماڵ وسامان لە شاری مەدینەدا.

وه شاری مەدینـەش تـەنها موسـلمانانی تیـادا نـەبوو بـەڵكو موسـڵمان وجولەكـە وبـت پەرستی تیادا دەژیـان، وە پێغەمبـەر فـەرمانی كـرد بـە نوسـینەوەی دەسـتوور وبـەڵێن نامەكە بۆ دیاریكردنی پەیوەندی وماف لەنێوان هـەموو خـەڵكانی مەدینـەدا، وە ئیمـان وبڕوا بوە بناغەی پەیوەندی لەنێوانیان وە ئـەو پەیوەندیـەی هۆزایـەتی لـە نێـوان بـوو ئەویش كاری پێ دەكرا وە لەو بەندانەی كەلەم بەڵێن نامەیە هاتووە:

١ ـ یارمەتی دانی كەسێ كەوتە ژێر باڵی قەرزو قۆڵەوە لە موسلمانان.

٢ ـ بەرگری كردن لە كەسێك ستەم ونانەوەی پەشێویو فیتنە بكات لە نێوان موسڵمان.

٣ـ نابێ موسڵمانان كافرێ سەرخا لەسەر موسڵمان.

٢ ـ موسڵمان یەك ریزن دژی دوژمنەكانیان

وەبەڵێن نامەكە دیاری كردنی مافی جولەكەكانی وە فەرمانیان دیاری كرد وەكو:

١ ـ هەر جولەكەیەك موسـڵمان بـوو دەبـێ موسـلمان سـەری بخـەن ویارمـەتی بـدەن لـە كەسێ كە ستەمی لێ بكات.

٢ ـ لەسـەر جولەكـەكان بـوو یارمـەتی وكۆمـەك بـۆ موسـلمان كۆبونـەوە بـۆ ئـەوەی موسولمانان سەر بخەن بەسەر كەسـانێ بیانـەوێ دەسـت درێـژی بكەنـە مەدینـە وە بەلێن نامەكە دیاری كردوە كە نابێت لە هیچ لایەنێك لە خەلكی مەدینـە پەیوەنـدی وپەییمان ببەسـتێ لەگـەل بـت پەرسـتانی قـورەیش دژی موسـلمانان وە هـەركاتێك تەنگ وچەلەمەیەك ڕووی دا دەبێ بگەرێتـەوە لای پێغەمبـەر بـۆ چارەسـەركردنی وە پەڕاوی بەلێن نامەی مەدینە دەستورێك بوو بۆ دیاری كردنی ماف و پێویسـتیەكانی خـەڵكی مەدینـە چ تـاك چ كۆمـەل وە بـوە دامەزرانـدنی كۆمەلگـە لەسـەر بناغـەی دادپەروەری ویارمەتی وهاوبەشی لەسەر خێر وچاكە لەنێوان موسـلمانان وخـەلكی تر.



## هەڵسەنگاندن

١ ئەو بناغەیە چی بووکە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە مەدینە لەسەری دامەزرا ؟

٢ دانایی پێغەمبەر لەچی دابوو بە نوسینەوەی بەڵێن نامەی مەدینە ؟

٣ چەماوە بکێشە بەسەر وەلامی ڕاست لەمانەی خوارەوە:؟

أ ـ پەڕاوی مەدینە دیاری کرد لەسەر جولەکەکان کە:

١ ـ دەبێ دینی خۆیان وازبهێنن بێنە سەر دینی ئیسلام(   ).

٢ ـ خۆیان دورە پەرێز بگرن لە موسلمانان وتێکەلاوی نەبن(   ).

٣ ـ یارمەتی وکۆمەك بن لەگەڵ موسلمانان بۆ بەرگری کردن لەمەدینە(   ).

ب ـ ئەگەر دوبەرەکی وتەنگ وچەلەمە رووی دا دەبێ بگەڕێنەوە لای:

١ ـ بە پرس کردن بە گەورەی سەرۆك هۆزەکانی مەدینە(   ).

٢ ـ بە پرس کردن بە گەورەی جولەکەکان.

٣ ـ بە پرس کردن وگەڕانەوە بۆ حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٤ نیشانەی ڕاست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ ـ لەماف و برایەتی موسلمان ئەوەیە یارمەتی کەسێ بدرێت کە کەوتە قەرزەوە.

ب ـ پێویستە موسلمان کافرێ سەرخا بەسەر موسلمانێ.

ج ـ موسلمانان یەکریزن بەرامبەر دوژمنان.

د ـ ڕێپێدراوە بۆ کەسێ لە خەلکی مەدینە پەیمان ببەستێ لەگەڵ بت پەرستی مەککە.

## وانەی دەیەم

# بازاری مەدینە



زۆربەی خەڵکی مەدینە سەرقاڵی کشتوکاڵ بوون وجولەکەکانیش سەرگەرمی بازرگانی وزێرینگەری بوون، وە ئەمە بوە هۆی ئەوەی کە دەولەمەندترین کەس بن لە شاری مەدینە، وە پێغەمبەری خوا پێی خۆش بوو موسلمانان ئابوری سەربەخۆیان هەبێ جیا لە جولەکەکان وە داوای لە موسلمانان کرد کە بازارێکی سەربەخۆیان هەبێ، ئەوەبوو ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد داوای لێ کردن شوێنێك دابنێین بۆ بازار، وئەوەبووە هۆی هاندانی موسڵمان چونکە ژمارەیەك لە کۆچکەران بازرگان بوون.

وە بازاریش لە ئیسلامدا تەنها بۆ بازرگانی نەبوو بەلکو شوێنی پەیرەوکردنی حوکمەکانی ئیسلام بوو لە کڕین وفرۆشتن، وە جولەکەکان سووربوون لەسەر

کۆکردنەوەی ماڵ وسامان بە دەست بڕین وناپاکی وسود وڕیبا وشت حەشاردان بۆ بەرزبونەوەی نرخی لە بازار وفێل وتەلەکە کردن لە کڕین و فرۆشتن دا.

وە پێغەمبەریش دەیویست موسلمانان سەروکاری بازرگانی بن بۆ ئەوەی ببنە پێشەوا بۆ نمونەی بازرگانی موسلمانان وە کەدروشمیان ئەم فەرمودەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ :(رَحِم الله رجُلاً سَمحاً اذا باع واذا اشترى) واتە: رەحمەتی خوا لەو کەسەبێ کە نەرم ونیانە لە کڕین وفرۆشتن دا، وە بازرگانی موسلمانان شت ناشارێتەوە بۆ گران بوون چونکە زیان بە خەلکی دەگات وە بازرگانی بۆ قازانجە نەك بۆ زیان وە بازرگانی موسلمان شت دەفرۆشێ وە قازانج دەکات بەلأم فرو فێل ودزی ناکات، وە ئیسلام حەرامی کردووە کە غەش وناپاکی بکرێت لە کڕین وفرۆشتن دا وە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی چاودێری بازاری دەکرد وسەردانی دەکردن وە هەوالی دەپرسین وحوکمەکانی کڕین وفرۆشتنی بۆ پیشان دەدات وداوای دەکرد کە سوربن لەسەر وەدەست هێنانی مال وسامانی حەلال وڕێپێدراو، ئەوەبوو رۆژێك چووە بازار و رەوسە گەنمێکی دیت لەبەر دەرگای دوکانێك دانرابوو کە دەستی خستە ناوی بینی ژێرەوەی تەڕبووە سەرەوەشی ووشك بوو فەرمووی : ئەمە بۆ وایە؟ ئەویش ووتی باران لیّ ی داوە ئەی نێردراوی خوا.

فەرمووی بۆ نەت خستە سەرەوەی بۆ ئەوەی کریار ببینێ ( کەسێ غەش وفێل بکات لە ئێمە نی یە) وە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی کردبووە سەروکاری بازارو ناوی (المحتسب) بوو وە کاروباری ئەمە بوو:

١ ـ چاودێری پێوانە وکێشانە بکات.

٢ ـ نەهی کردن لەغەش وفێڵ لە کڕین وفرۆشتن.

٣ ـ چارەسەرکردنی وتەنگ وچەڵەمەی بازار.

وە دامەزراندنی بازارێکی سەربەخۆی موسلمانان لە مەدینە بەردی بناغەی ئابوری ئیسلامی بوو بۆ بنیات نانی دەوڵەتی ئیسلامی تازە پێگەیشتوو وە دەوڵەمەندەکانیش یارمەتی دەرو کۆمەك بەخش بوون بۆ ڕێك خستنی سوپا ومال بەخشین لە پێناوی خوادا بۆ جیهاد وتێکۆشان وە نمونەش لەوانە ئەبو بەکروعوسمان وعەبدولرەحمانی کوڕی عەوف وچەندێکی تر لە هاوەڵان (رضی الله عنهم).



## هەڵسەنگاندن

١ بۆچی پێغەمبەر سوور بوو لەسەر دامەزراندنی بازاری موسلمانان لە مەدینە ؟

٢ دروشمی بازرگانی موسلمانان چی بوو لە کڕین وفرۆشتن ؟

٣ نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ ؟

أ ـ بازرگانە جولەکەکان سوور بوون لەسەر فێڵ وتەلەکە نەکردن.

ب ـ پێغەمبەر چاودێری بازاری دەکرد وسەردانی دەکردن.

ج ـ بازرگانی موسڵمانان فێڵی لەو کەسە دەکرد کە شتی لێ دەکڕی ودەیفرۆشتەوە.

د ـ بازار لە ئیسلامدا بۆ بازرگانی وپەیرەوی حوکمی ئیسلامی بوو.

هـ ـ کاری (المحتسب) ئەوە بوو چاودێری پێوانە وکێشانەی دەکرد.

٤ چەماوە بکێشە بەدەوری وەلامی ڕاست لەمانەی خوارەوە:

أ ـ لەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بەدانانی بازاڕ بۆ مسولمانان

١ ـ ڕاوێژی کرد لەو شوێنەی کە بازار بوو لە پێش دا.

٢ ـ راوێژی بە بازرگانە کۆچکردوەکان کرد.

٣ ـ ڕاوێژیان کرد بە بازرگانە جولەکەکان.

ب ـ جولەکەکان لە مەدینە لە پێش ئیسلام

١ ـ بازرگان وزێرینگر بوون.

٢ ـ سەرقالی کشتوکال بوون.

٣ ـ سەرقالی پیشەسازی بوون.

ج ـ بازرگانە موسلمانەکان لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ

١ ـ یارمەتی دەری خەبات کاران بوون لەپێناوی خوا.

٢ ـ سووربوون لەسەر بەرژەوەندی وشت شاردنەوە.

٣ ـ فێل وغەشیان دەکرد لە بازرگانیەکان.

# وانەی یازدەیەم

## بانگدان

موسلمانان سووربوون لەسەر نوێژکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا لە مزگەوتی پێغەمبەر، پاش بنیات نانی مزگەوت وە دانیشتن لەگەڵیان دا وە بۆ ئەوەی گوێبیستی قورئانی پیرۆز بن کە دادەبەزی بەسەر پێغەمبەری خوا، وە پرسیاریان لێ دەکرد سەبارەت بە ئاینی ئیسلام وە بۆ وەدەست هێنانی پاداشتی نوێژی بەکۆمەل وە هیچ شتێ نەبوو کە موسلمانان ووشیار بکاتەوە بە هاتنی کاتی نوێژەکان وە نوستوو بەئاگا بهێنێت بچێت



بۆ نوێژ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە هاوەلان کرد بۆ هۆیەك بۆ بەئاگا هاتنی خەڵکان بۆ کاتی نوێژ، ئەوە بوو هەندێکیان پێشنیاریان کرد بە بەکارهێنانی کەڕەنا (بوق) بۆ زانینی ویانگەوازی کاتی هاتنی نوێژ و وەیەکێك لە موسلمانان پێشنیاری ئەوەی کرد کە زەنگۆلە بەکاربهێنن، بەڵام پێغەمبەر بە هیچ لەمانە قایل نەبوو وە پێی خۆش نەبوو وە تا ماوەیەك موسلمانان سەرقالی ئەم جۆرە شتانە بوون و تا ئەوە بوو کە عەبدوللای کوری زەیدی ئەنصاری خەوێکی بینی وە لەو خەوە پیاوێکی دیت کە زەنگۆڵەی پێ بوو ئەویش لێ ی دەپرسێ ئەم زەنگوڵە نافرۆشی؟ پیاوەکەش ووتی بۆ

چیته؟ عەبدوڵلاش وتی خەلکی پیٚ بانگ دەکەم بۆ زانینی کاتی هاتنی نوێژ، ئەویش وتی شتێکت پیٚ بڵێم لەوە چاکتر بێت ئەویش وتی بەڵێ ئەویش بانگی فێرکرد، وە عەبدوللای کوڕی زەید ئەم خەوەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە وە پێغەمبەریش زانی ئەوە لەلایەن خواوە بووە وخەوەکە راستە بۆیە بە عەبدوللای کوڕی زەیدی فەرموو برۆ بیلال بانگ بکەو وە بیلالیش دەنگی زۆر خۆش بوو وە لەڕێگادا گەیشتن بە عومەری کوڕی خەططابوەهاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وعومەر فەرمووی: سوێندم بەخوا منیش هەمان خەوم بینیوە، وە ئەم بانگە بوو بە بانگی نوێژ بۆ موسلمانان وە ئەمەش جیا بۆوە لە بانگی جولەکە وگاورەکان.

## هەڵسەنگاندن

١ بۆچی موسلمانان سووربون لەسەر نوێژکردن لە مزگەوتی پێغەمبەر ؟

٢ سوودی چیە دانانی بانگ بۆ نوێژ ؟

٣ نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنیٚ ؟

أ ـ موسلمانان رەتیان کردەوە بە بەکارهێنانی (بوق) کەرنا چونکە جولەکەکان بەکاریان دەهێنا.

ب ـ موسڵمانان حەزیان دەکرد زەنگولەی (الناقوس) بەکاربهێنن چونکە گاورەکان بەکاریان دەهێنا.

ج ـ بیلال بوو بەبانگبێژی پێغەمبەر چونکە دەنگی زۆر خۆش بوو.

د ـ سروش هات بۆ پێغەمبەر دەربارەی بانگدان.

هـ ـ دانانی بانگ بە خەون پەیڕەو کرا.



## وانەی دوانزدهەم

# گۆرینی ڕووگە ( قیبلە )





مزگەوتی ئەقسا (لە قودس) لەکۆنەوە ڕووگە وقیبلەی موسلمانان بوو هەتا لەو کاتەی لەمەککەش بوون وە پێغەمبەری خواش کە نوێژی دەکرد کەعبەی دەخستە نێوان خۆی وقودسەوە، وە لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە خۆی وموسلمانان تا شازدە مانگ هەر لەکاتی نوێژدا ڕوویان دەکردە قودس.

وە پێغەمبەر ﷺ زۆری حەز دەکرد کە خوای گەورە ڕووگەی بۆ بگۆڕێ لە قودسەوە بۆ کەعبە وە بەجوبرائیلی فەرموو حەزدەکەم خوای گەورە ڕووم وەرگێڕێ لە قیبلەی جولەکەکان وبۆ قیبلەی کەعبەی پیرۆز بەڵام جوبرائیل فەرمووی منیش وەکو تۆ بەندەی خوام بەڵام تۆ داوا لە خوا بکە وە دوعات گیرا دەبێت، وە لەم کاتە ئەم ئایەتە هاتە

خـــوارەوە: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ ........ ﴾ البقره ١٤٤.

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەڕاستی چاو گێڕان وهەلسورانی رووخسارت روو بـە ئاسمـان دەبینین کە بەهیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بـووین سـوێند بەخوا ئێمەش رووت وەردەچـەرخێنین بـۆ رووگەیـەك پـێ ی رازی وخۆشنوود بیت، دە رووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام) وە جولەکەکان ودووروەکان وبت پەرستان ئەم رووگە گۆڕینەیان کردە بەهانە وبەد گومانی بۆ موسولمانان لە ئاینەکەیاندا )

تەفسیری ئاسان.

جولەکەکان دەیانگوت موحەمەد جیاوازی کرد لە ڕووگەی پێغەمبەرانی پێش خۆی وە ئەگـەر پێغەمبەر بوایە دەبوا لەسەر رووگەی پێغەمبەران بمابایە وە جولەکـەکان لـەبیریان چـوو کە کەعبە قیبلە ورووگەی باوکی پێغەمبەران ئیـبراهیم بـوو وە دووڕووەکـان دەیـان ووت ئەگەر قودس حەق بوایە ئەوا موحەمەد وازی لە حەق هێناوە وە ئەگەر قیبلەی دووەم ڕاست بێ ئەوا پێغەمبەر لە پێش ئێستا لەسەر ناراسـتی بـووە وە وەلامـی پێغەمبـەر بـۆ ئەمـە ئەوە بوو کـە گـۆڕینی قیبلـەش بـە فـەرمانی خـوا بـووە وە بـت پـەرستانیش گومانیـان ئەوەبوو کە گۆڕینی قیبلە بۆ کەعبە واتە گەرانـەوە بـۆ قیبلـەی ئـەوان کـە کەعبەیـە وە کەیف خۆشبوون و وتیان لەوانەیە کـە لـە دوارۆژدا موحەمەد بـەدوای ئێمـە بکـەوێ وە بـت پەرستان نەیان دەزانی کـە کەعبـە رووگـە وقیبلـەی ئیـبراهیم بـوو نـەك هـی ئـەوان. وە موسلمانان ووتیان گوێرایەل بووین وفەرمانبەرداری ئەوین وە زانیان کـە پێغەمبـەر هـیچ کارێ ناکات تەنها بە فەرمانی خوا نەبێت.

وە قورئانی پیرۆز ئەم بەد گومانەی دڵی دوژمنانی تۆمارکردووە کە پاش گۆڕینی قیبلە رووی دا کە دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ ﴾البقرە ١٤٢.

واتە: نەفام و دڵ بەتاڵەکان لە خەڵکی، لەدوای گۆڕینی رووگە لە قودسەوە بۆ کەعبە دەڵێن باشە چی وای لێکردن واز لە رووگە وقیبلەی پێشووەکە بێنن کە جاران روویان تێدەکرد پێیان بڵێ رۆژهەلات ورۆژئاوا وهەموو لایەك خوا خاوەنیەتی، هەرکەسێکی بوێت رێنمونی دەکات بۆ رێگەو رێبازی راست ورەوان هەرچەندە گۆڕا قیبلە لە قودس بۆ کەعبەی پیرۆز بەڵام قودس جێگاو رێزی تایبەتی خۆی هەیە لە دڵی موسڵمانان چونکە قیبلەی یەکەم وشوێنی شەو رەوی وبڵندبوونەوەی پێغەمبەر موحەمەد بوو بۆ ئاسمانەکان وە سێیەم مزگەوت بوو پاش دوو مزگەوتەکەی مەککەو مەدینە کە دروستە موسڵمانان بارەگاو بنەگە بپێچنەوە بۆ چوونی بۆ ئەو شوێنانە ونوێژیش ئەجر وپاداشتی تایبەتی چەندان قاتی هەیە لەوێ.

## سوودێك

لە شاری مەدینەی منەوەرە مزگەووتێك هەیە پێی دەڵێن مزگەوتی دوو قیبلە (القبلتين) لەبەر ئەمە بوو، کە ئەم ئایەتانەی فەرمانی گۆڕینی قیبلەی کرد کە دابەزی پیاوێ هاتە لای موسڵمانان کە لەم مزگەوتە نوێژیان دەکرد بەرەو لای قودس وە ئاگاداری کردن کەتازە جوبرائیل دابەزی بۆ لای پێغەمبەر وە روویان کردە کەعبە وە ئەوانیش دەرحال لە شوێنی خۆیان روویان کردە کەعبەی پیرۆز بۆیەناوونرا مزگەوتی دوو قیبلە(القبلتين).

## هەڵسەنگاندن

١ ئەو قیبلەیە چی بوو کە موسلمانان لە پێش کۆچیان بۆ مەدینە ڕوویان تێ دەکرد؟

٢ بۆچی پێغەمبەر ﷺ پێ ی خۆش بوو ڕووی بکاتە کەعبە ؟

٣ بۆچی بت پەرستان کەیف خۆش بوون بەڕوو وەرگێرانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو کەعبە؟

٤ نیشانەی ڕاست (√) بەرامبەر ڕستەی ڕاست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ ـ کەعبە قیبلەی موسلمانان بوو پێش کۆچ کردن.

ب ـ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو قودس نوێژی دەکرد پاش کۆچ کردن بە شازدە مانگ.

ج ـ جولەکەکان کەیف خۆش بوون بە گۆڕینی قیبلە لە قودسەوە بۆ مەککە.

د ـ کەعبەی پیرۆز قیبلەی ئیبراهیم پێغەممبەر بوو(علیه السلام).

# وانەی سیانزەهەم

## سریەو غەزاکانی پێغەمبەر ﷺ



پێغەمبەر پێش کۆچ کردنی بۆ مەدینە دەچوو بۆ لای هۆزەکانی عەرەب وبانگی دەکردن بۆ ئیسلامەتی وپێی ڕادەگەیاندن کە پێغەمبەری خوایە ونێراوی خوایە وداوای لێ دەکردن کە بەراستی بزانن وبروای پێ بکەن وبیپارێزن لە ئێش وئازاری خەلکان تاکو بتوانێ خەلکان بانگ بکات بۆ ئیسلامەتی.

وە تاوای لێهات خوای گەورە سینگی ئەنصاریانی کرەدەوەو ژمارەیەکی زۆریان بروایان پێ هێنا وە پەیمانیان پێ دا لە دوو پەیمان دا: لە پەیمانی عەقەبەی یەکەم پەیمانیان دا کە هاوەڵ وشەریك بۆخوا بریارنەدەن ودزی نەکەن وداوێن پیسی نەکەن ومنالی خۆیان نەکوژن، وە پەیمانی دووەم کەپەیمانی عەقەبەی دووەم بوو کە دەبێ بیپارێزن هەروەکو چۆن ماڵ و منالیی خۆیان دەپارێزن لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ کەسێ جەنگی لەگەڵ بکات.

وە کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە شوێنی دەست پێ کردنی بانگەوازی ئیمانی بوو وە توانی بانگەوازی بگوازێتەوە بۆ ژینگەیەکی تر کەبتوانێ جێگای خۆی بکاتەوە وە بتوانێ ئەمن وئاسایش دابین بکات بۆ هاوەلانی ئەوانەی کە کۆچیان لەگەلی کردووە بۆ مەدینە وە کۆچکردنیش بۆ راحەت وحەسانەوە نەبوو بەلکو بۆ گەیاندنی بانگەوازی خودا بوو وە بۆ دامەزراندنی دەولەتی ئیسلامی بوو.

وە قوورەیشیەکانیش دەستەوەسان نەوەستان بەرامبەر ئیسلام وموسلمانان، وە زانیان مەترسی بلاوبونەوەی ئیسلام تادێت زیاتر دەبێت ئەوەبوو کافرو بت پەرستەکانی مەککە بانگەوازی سەرکردەکانی مەدینەیان کردو کە ئەگەر بێت وموسلمانان وەدەر نەنێن لەمەدینە ئیتر ئەوانیش هێرشیان دەکرێتە سەر، وە بەم هۆیەوە دەبێ پێویستە موسڵمانان هێزێکی وایان هەبێت بۆ بەرگری کردن وپارێزگاری کردن لەم دەولەتە بچوکەی تازە پێگەیشتوو بکەن، وە بەهۆیەوە بتوانن شاری مەککەش ئازاد بکەن لە بت پەرستی، وە بەس تەنها بت پەرستی مەککە دوژمنی سەرسەختی موسلمانان نەبوو بەلکو لەهۆزە عەرەبەکانیش هەموویان دوژمنی ئیسلام بوون وە دەبێ هێزێکی ئامادە کراو هەبێت بۆ ڕاوەستان بەرامبەر کەسانێ کە بیانەوێ دژی دینی خوا بوەستن تا ئەوەبوو لە سالی یەکەمی کۆچی خوای گەورە مۆلەتی موسلمانانی دا بە جیهاد کردن و تێکۆشان لەپێناوی خوا وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم بۆنەیەوە چەند سریەی ناردە دەوروبەری شاری مەدینە بۆ هەواڵ وزانیاری وە زۆربەیان لەژێر فەرمانی خۆی دابوو وە ئەو جەنگانەی خۆی بەشداری دەکردن ڕاستەوخۆ پێی دەوترا جەنگ (غزوە) وە ئەو جەنگانەی خۆی راستەوخۆ بەشداری نەدەکرد پێی دەوترا سریە، وە ژمارەی غەزاکانی

پێغەمبەری خـوا ﷺ گەیشـتە بیسـت وحـەوت غـەزاو ژمـارەی سـریەکانی گەیشـتە سـی وهەشت سریە.

ژیانی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە بەردەوام لە جیهاد وتێکۆشان دابوو کە دوورگەی عەرەبی گرتەوە لەهەموو لاوە کەبوە هۆی پاکردنەوەی ناوچەکە لـە بـت پەرسـتی ورزگـارکردنی مەککە وپاککردنەوەی کەعبەی پـیرۆز لـە بـت وسـەنەم، وە خـەڵکی هاتنـە نـاو ئیسـلام کۆمەڵ کۆمەڵ، وە سوپای ئیسلام گەیشتە ناو تەبوك بـۆ راونـانی رۆمـەکان، وەسـوپای ئیسلام گەیشتە مۆتە وناوچەی ئەردەن وەموسلمانان خۆیان بۆ پاککردنەوەی زەوی بـە تێکرا ئامادەکرد بۆ بلاو کردنەوەی بانگەوازی ئیسلام لەنێوان خەلکی دا.

## هەڵسەنگاندن

١ پێغەمبەر ﷺ چی دەویست کاتێ خۆی دەگەیاندە ناو هۆزی عەرەبەکان ؟

٢ ئەنصاریەکان لەسەر چی پەیمانیان دا بە پێغەمبەر ﷺ لە پەیمانی عەقەبەی یەکەم ؟

٣ نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ.

أ ـ ئەنصاریەکان دووو جار پەیمانیان دا بە پێغەمبەر.

ب ـ قورەیشیەکان وەستان لـە دوژمنـداری و فێـل کـردن لەموسـلمانان پـاش کۆچـی موسلمانان.

ج ـ کۆچ کردن بۆ داوای راحەت وحەسانەوە نەبوو.

د ـ بت پەرستانی مەککە بەتەنها ئەوان دوژمنی ئیسلام بوون.

**٤** هەر رستەیەك بگەیەنە بەتەواوکەری رستەی بەرامبەری لەمانەی خوارەوە.

| | |
|---|---|
| ئەنصاریەکان پەیمانیان دا بەپێغەمبەر لە پەیمانی عەقەبەی دووەم. | (سریە) |
| قورەیشەکان هەڕەشەی گەورەکانی مەدینەیان کرد بەشداری لەگەلیان | (غەزا) |
| ئەو جەنگانەی کەپێغەمبەری خوا بەشداری دەکرد پێی دەوترا. | (ئەگەر موسلمانان وە دەرنەنێن لەمەدینە) |
| ئەوشەرانە پێغەمبەری خوا بەشداری نەدەکرد پێی دەوترا | (لەسەر پاراستنی شەڕکردن لەگەل کەسێ شەڕیان لەگەل بکات.) |

## وانەی چواردەهەم

# غەزای بەدر ( ٢ی کۆچی )



**هۆی شەرەکە**

موسـلمانان کۆچـیان کـرد بـۆ مەدینـەی پـیرۆز وە سـووربون لەسـەر پـەیڕەوی ئاینەکـەیان وە مـاڵ وسـامانیان لەمەککـە جـێ هێشت وبت پەرستەکان دەستیان بەسـەرداگرت وە بازرگانیـان پێوە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگەدار کراوە کەوا کاروانێکی گەورەی قورەیشیانی مەککە بەڕێوەیە لەگەرانەوەیدا لەشامەوە بۆمەککە وەئەوەش لەمانگی رەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بوو، وە پێغەمبەر داوای لەموسلمانان کرد بۆ دەرچوون بۆ ئەوەی ئەو ماڵ سامانەی کە لەمەککە دەستیان بەسەرداگیرا بوو وەریبگرنەوە وە ئەوەی شایەنی باسە هەموو هاوەڵان بەشداریان نەکرد لەم دەرچوونە تەنها ژمارەیەکی کەم نەبێت کە دەگەیشتە سێ سەت وچواردە پیاو، وەموسڵمانان لەو باوەڕەدا نەبوون کە جەنگ بەرپابێ لەنێوان خۆیان وبت پەرستان.

رزگاربوونی کاروانە:

دەنگ وباسی موسلمانان گەیشتە ئەبوسوفیانی کوری حەرب سەرکردەی کاروانەکە وە ئەویش لەلای خۆیەوە خزمەتکارێکی بەناوی (زەم زەم) ناردە مەککە بۆ ئاگاداری خەڵکی مەککە لە هاتنی سوپای ئیسلام بەرەو رووی کاروانەکەیان وە لەهەمان کاتدا خۆشی رێگای کاروانەکەی گۆری بە رێگای تردا دەرچوو بۆ مەککە وە لەرێگادا پیاوێکی تری ناردەوە بۆ مەککە وئاگاداری کردنەوە کە بگەرێنەوە، کاروانەکە وا رزگاری بوو.

بەڵام سوپای بت پەرستان بەسەرۆکایەتی ئەبوجەهل لەگەل هەزار سوار بەرەو رووی موسلمانان چوون سووربون لەسەر نەگەرانەوە، بۆ چوون بەرەو (بەدر) لەوێ ئاژەڵ سەربرن مەی بخۆنەوە وگۆرانی وسەما بکەن وە موسلمانان چاو ترسای بکەن وجارێکی تر موسلمانان نەتوانن بیری شتی وا بکەنەوە.

رۆیشتن بەرەو بەدر:

پێغەمبەری خوداش بە دەرچوونی قورەیشیان ئاگادار بوو، ئەمەبوو راوێژی بە هاوەلانی کرد وەکۆچەرانیش پشت گیری خۆیان بۆ پێغەمبەر دوپات کردەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەنصاریەکانی مەدینە بوو چونکە پەیمانی ئەنصاریەکان لەمەدینە بوو کە لەناو جەرگەی شار پێغەمبەر وهاوەلان بپارێزن ئێستا ئەوە دوژمن لە دەرەوەی شار هاتووە، دەیویست لەگوفتاری ئەنصاریەکان تێ بگات وەئەنصاریەکان قسەیان کرد وپشت گیری خۆیان بۆ پێغەمبەر وموسلمانان دوپات کردەوە وە پێغەمبەریش بە ووتەی ئەوان گەشایەوە ودڵخۆش بوو وەمزگێنی دان بە سەرکەوتنی خوا فەرمووی برۆن ئێستا خوا مژدەی سەرکەوتنی دا.



## مزگێنی سەرکەوتن

موسلمانەکان پێش قورەیشیەکان گەیشتنە بەدر، حوبابی کوری مونزیر ئاماژەی بەوە کرد پێویستە موسلمانان دەست بەسەر سەرچاوەی ئاوی بەدر دابگرن وە نەهێلن کەبت پەرستان ئاویان چەنگ کەوێ وە پێغەمبەری خواش ﷺ بەم پێشنیارە رازی بوو وە هەرلەپێش ڕوودانی جەنگ خوای گەورە هەندێك نیشانەی سەرکەوتنی بە موسڵمانان پیشان دا ئەوەبوو دڵ دامەزراووبوون وەکەمێك خەوی بەسەردا هێنان لەشەوی جەنگەکەدا بۆ ئەوەی بەرۆژ بەهێزبن بەرامبەر دوژمن وەخوای گەورە بارانی بەسەر داباراندن بۆبەهێزبوونی زەویەکە لەژێر پێیان وە یارمەتی دان بەدابەزینی فریشتە بۆ بەهێزبووونی سوپای ئیسلام وکە لەگەڵیان شەڕیان دەکرد وەترس وبیم بخەنە ناو دڵی بت پەرستان وە قورئانی پیرۆز ئەم باسەی تۆمارکردوە کەدەفەرموێ:﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ﴾ الأنفال: ١١-١٢.

ئەو مژدەو ئارامی دڵە کاتێك بوو کە خوای گەورە بەوەنەوز دایگرتن بۆ ئەوەی هێمنیەك بێت لەلایەن خۆیەوە وەئاوێکیشی لەئاسمانەوە بەسەرتاندا باراند بۆ ئەوەی خاوێنتان بکاتەوە وپێی بوخلی شەیتانتان لێ دووربخاتەوە وە دڵەکانتان بەهێزو دامەزراو بکات وبیانبەستێت بەخواوە وە بەپێیەکانتان جێگیر وقایم بکات (١١) ئەی موحەمەد بیری ئەوە بکەرەوە کاتێ پەروەردگارت وەحی ونیگای دەرکرد بۆ فریشتەکان کە بەراستی

من یارو یاوەرتانم، کەوابوو ئێوەش دڵی ئیمانداران پابەند ودامەزراو بکەن لەمەودوا منیش ترس وبیم دەخەمە دڵی ئەوانەی کە بێ باوەرن دە ئێوەش لەسەروو گەردنی ناپاکان بدەن ودەست بوەشێنن لەهەموو سەرەپەنجەکانیان. تەفسیری ئاسان ل ١٧٨

## سەرکەوتن لەجەنگەکە

جەنگ دەستی پێکرد بەشمشێر بازی لەنێوان سێ سواری موسڵمان وسێ سواری بت پەرستان وە لەم شمشێر بازیە هەر سێ سوارە بتپەرستی یەکە کوژران و وەلەموسلمانان یەك شەهید بوو وە لەپاشان شەڕ دەستی پێکرد و پێغەمبەر ﷺ لە خوا دەپاڕایەوە نزاو دوعای دەکرد کە سەرکەوتن بەشی موسلمانان بێت وە موسلمانانی هان دەدا بۆ جەنگ کردن وە بەڵێنی بەهەشتی پێ دەدان وە دەیفەرموو (سوێندم بەوخوایەی کە گیانی منی بەدەستە هەر پیاوێ لە ئێوە بکوژرێ ئارام گری وداوای پاداشت لەخوا بکات وە پشت نەکات لەجەنگ ئەوا خوای گەورە دەی خاتە بەهەشتەوە) وە عومەیری کوڕی حومامی ئەنصاری گوێ ی لەم ووتەیە بوو فەرمووی نێوانی من وبەهەشت تەنها ئەوەبێت کە بکوژرێم وەچەند دەنکە خورمایەکی لەدەست دابوو فرێ ی دان وشەڕی کردو تاشەهید بوو.

وە خوای گەورە موسولمانانی سەرخست بەسەر بت پەرستان، وە حەفتایان لە بت پەرستان کوشت وحەفتای تریان لێ بە دیل گیرا وەلەکوژراوەکان زۆربەیان سەرکردەی قورەیشیان بوون، وە لەموسلمانان چواردە کەس شەهید بوون وە جەنگی بەدر جەنگی جیاکەرەوە بوو لەنێوان بێ بڕوا وئیمانداران لەمێژووی ئیسلامدا چونکە یەکەم سەرکەوتنی گەورەبوو کە موسلمانان بە دەستیان هێنا بەسەر بت پەرستان.

## سوودێك

ناونرا بە جەنگی بەدر وە بەڕۆژی جیاکەرەوە (الفرقان) لەبەر ئەوە خوا دەفەرمووێ:

﴿.... وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ.....﴾ واتە: دامان بەزاندووە بەسەر بەندەمان پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جیاکردنەوەکەدا کە غەزای بەدرە ئەو ڕۆژەی کە هەردوو لەشکر بەرەنگاری یەك بوون. تەفسیری ئاسان ل١٨٢ وە بۆیە ناونرا چونکە خوای گەورە ئەم شەڕەی کردە جیاکەرەوەی راستی بەسەر ناراستی دا.

## هەڵسەنگاندن

١. هۆی چی بوو موسلمانان مافی ئەوەیان هەبوو کە دەست بەسەر کاروانی قورەیش دابگرن ؟

٢. لەپاش دەرباز بوونی کاروانی قوڕەیشیەکان رای موسلمانان چی بوو لەوکاتەی پێغەمبەری خواراوێژی پێکردن ؟

٣. باسی هاوەڵی بەرێز عومەیری کوری حومام بکە لەجەنگی بەدر؟

٤. نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوەدا:.

أ ـ لەکاتی دەرباز بووونی کاروانەکە ئەبو سوفیان داوایلە خەلکی مەککە کرد کە شەڕ بکەن لەگەڵ موسلمانان.

ب ـ ئەبو جەهل بەردەوام بوو لەسەر چونە بەدر پاش دەرباز بوونی کاروانەکە.

ج ـ خوای گەورە خەوی خستە سەر موسلمانان وبارانی بەسەردا باراندن.

د ـ لەجەنگی بەدر چەند بت پەرست کوژران.

## وانەی پانزەهەم

# دەرکردنی جولەکەی بەنی قونەیقاع لەشاری مەدینەی منەوەرە

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەسەرەتای هاتنی بۆ مەدینە وە پەیمانی ئاشتی لەگەل جوولەکەکان مۆر کرد وە موسڵمانان لەسەر پەیمانی خۆیان مانەوە بەڵام جوولەکەکان چەند جارێك پاشگەزبوونەوە وپەیمانیان شکاند وە دەم درێژیان دەکرد کاتێ موسمانان لەبەدر سەرکەوتن بەسەر بت پەرستان دا، وە گاڵتەیان بەم سەرکەوتنە دەکرد، ئەوە بوو بەنهێنی کۆمەڵێکیان نارد بۆمەککە بۆ هاندانی قورەیشیەکان بۆ تۆڵەکردنەوە لە موسڵمانان وە دەستی یارمەتیان بۆ قورەیش درێژکرد وە پشتگیریان کردن بە چەك و ماڵ وسامان.

نەوەی قونەیقاع یەکەم کەس بوون کە لەمەدینە پەیمانیان شکاند لە جولەکەکان وە خۆیان زاڵ کرد بوو بەسەر بازاری مەدینەدا، وە پێغەمبەری خوا لەپاش جەنگی بەدر بۆیان چوو وە کۆی کردنەوە لە بازاردا بانگی کردن بۆ ئیسلام وە ئاگەداری کردنەوە لەوەی کەچی توشی قورەیشیەکان بوو،تووشی ئێوەش دەبێت ئەگەر بیر لە شەڕ بکەنەوە لە دژی موسلمانان، بەڵام ئەوان وەڵامی پێغەمبەری خوایان نەدایەوە رەتیان کردەوە بە رەتکردنەوەیەکی ناشیرین وە ووتیان بە پێغەمبەر کە قورەیشیەکان لەبارەی شەر وجەنگ زانیاریان نی یە وەکو جولەکە دەبێ موسلمانان چاك بزانن کە شەر لەگەل بەنوقونەیقاع شەرکردنە لەگەل شاخ وە شەرێکی قورسی بەدوا دادێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاش ئەوەی ئاینی ئیسلامی پێ ڕاگەیاندن ئەوان لەسەر کوفری خۆیان بەردەوام بوون، تا ئەوەبوو ئافرەتێکی موسلمانان ڕۆژێ دەچێتە بازاری جوولەکەکان بۆ ئەوەی پارچە زێرێ بکرێ لە زێرینگەرێ کەجولەکە بوو وە دەم وچاوی داپۆشیبوو بەڵام جولەکەی زێرینگەرەکە داوای لێ کرد کە دەم وچاوی خۆی دەرخات ئەویش ڕازی نەبوو وە لەدوایی دا جولەکەکە هەلسا بە بەستنەوەی لەچکی عەباکەی لەپشتیەوە وە لەئەنجام دا کە ئافرەتە موسلمانەکە هەڵسا دەم وچاوی ولاشەی دەرکەوت وە جولەکەکان ئەوەی لەوێ بوون گاڵتەیان پێ کرد ودایانە قاقای پێکەنین وەئافرەتەکە هاواری کرد بۆ موسلمانێ لەوێ ڕەت بوو گوێی لێ بووهەلسا جولەکەکەی کوشت وەجوولەکەکانیش موسلمانەکەیان کوشت وە لەپاش ئەم ڕووداوەدا هیچ بەهانەیەك بۆجولەکەکان نەما تەنها ئەوەبوو چوونە ناو قەلای خۆیان خۆیان توند کرد وبانگەوازی شەریان دا پێغەمبەری خواش چەند ڕۆژێك چواردەورەی گرتن وخوای گەورە ترس وبیمی خستە نێو دڵی جولەکەکان وبە ملێ شۆڕی هاتن تەسلیمی موسلمانان بوون وە عەبدوللاّی کوری ئوبەی گەورەی دووڕوەکان کەهاوپەیمانی بەنو قونەیقاع ترسا لەوەی کە پێغەمبەر فەرمانی کوشتنیان بۆ دەربکات بۆیە هاتە لای پێغەمبەر وداوای تکای لێ کردن کەچاکە یان لەگەل دابکات وە پێغەمبەری خواش تکای ڕاگرت و چاوپۆشی لێ یان کردن وفەرمانی دا کە دەبێ شاری مەدینە بە جێ بهێلن وە ئەوانیش بەسەلتی هەموویان شاری مەدینەیان جێ هێشت وچوونە شام ماڵ وسامانیان بوو بەتالان بۆ موسلمانان بە سزای خۆیان گەیشتن.

## هەڵسەنگاندن

١- جوولەکەکان چۆن پیشوازی لە سەرکەوتنی موسلمانانیان لەجەنگی بەدر ؟

٢- رای نەوەی قونەیقاع چی بوو لە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا بانگی کردن بۆ ئیسلام ؟

٣- چەماوە بکێشە بە چواردەوری وەلامی راست لەمانەی خوارەوە ؟

أ ـ لەوکاتەی زێرینگەرە جولەکەکە پەلاماری ئافرەتە موسلمانەکەی دا

١ ـ ئافرەتەکە شەرمی کرد وچووە دەرەوە لەبازار.

٢ ـ ئافرەتەکە لە زێرینگەرەکەیدا.

٣ ـ هاواری بۆ موسلمانان هێنا وموسولمانێك جولەکەکەی کوشت.

ب ـ هۆی دەرکردنی نەوەی قونەیقاع لەمەدینە ئەوەبوو

١ ـ ئاینی ئیسلامیان رەتکردەوە.

٢ ـ لەبازرگانیدا بازاریان گران کرد.

٣ ـ دوژمنکارانەیان نەیان کرد بەسەر ئافرەتی موسلمان.

ج ـ لەو کاتەی عەبدوللای کوری ئوبەی تکای بۆ جولەکەکان کرد

١ ـ پێغەمبەری خوا لێیان خۆش بوو.

٢ ـ چاوپۆشی لێ کردن ودەری کردن لە مەدینە ومالّ وسامانیان بووبەتالان بۆ موسلمانان.

٣ ـ فەرمانی کرد بە کوشتنی پیاوەکانیان ودەست گرتن بەسەر مال وسامانیان.



## وانەی شازدەهەم

# جەنگی ئوحود سالی ٣ی کۆچی



دۆڕانــی بــت پەرســتانی مەککــە لــە جــەنگی بــەدر شــوێنەوار وکاریگــەریان لــەدڵی قورەیشیەکان بەجێ ماو بریاریان دا کە تۆڵەی خۆیان بکەنـەوە وە ئـەو مـاڵ وسـامانەی کە لەکاروانی ئەبو سـوفیان بـەرەو مەککـە هاتـەوە سـەرفی بکـەن بـۆ کۆمـەکی جـەنگ وتۆڵەی خۆیان پێ بکەنەوە وە هێرش بکەنە سـەر مەدینـە، ئـەوە بـوو سـوپایەکی سـێ هەزار شەڕکەریان ئامادەکرد وە ئافرەتەکانیشیان لەگەل خۆیان بـرد وبـۆ هانـدان وسـۆز جولاندن وەنەهێشتن لە ڕاکردن لە جەنگ وە لەم کـەین وبەینـەدا قورەیشـیەکان خۆیـان ئامادەکرد عەبباسی مامی پێغەمبەر نامەیەکی بـەنێردراوی خـۆی نـارد بـۆلای پێغەمبـەر وتیێ ی گەیاند کە خەلکی مەککە دەیانەوێت بدەن بەسەر مەدینەدا وە عەبباس لەمەککە بوو وە موسولمانیش بوو بەلام پێغەمبەر ئیزنی ئەوی دا لەمەککە بمێنێتەوە.

وە پێغەمبەری خواش موسولمانانی کۆکردەوە وئاگاداری کردن بەوەی کە قورەیشیەکان دەیانەوێت بێن بۆ شەر وە رای ئەوەبوو کەلەمەدینە بمێنێتەوە وەخۆیان قایم بکەن وکەبت پەرستان وویستیان بێننە ناو شار ئەوان لەسەر بانان لێ یان بدەن وە هەندێکیان رایان وابوو، وە ڕای عەبدوللای کوری ئوبەی گەورەی دووڕووەکانیش بوو وە رای زۆرینەی موسولمانان ئەوە بوو کە شەر لە دەرەوەی شار بکرێ وە خاوەنی ئەم ڕایە گەنجە خوێن گەرمەکانی کە بەشداری جەنگی بەدریان نەکردبوو دەیان ویست شەر بکەن وە پێغەمبەری خواش ﷺ رای ئەوانی پەسند کردو بەرەو کێوی ئوحود کەوتە رێ وە ژمارەی موسولمانەکان هەزار جەنگاوەر بوون وە لەرێگادا پێغەمبەری خوا بۆی روون بۆوە کە دووڕووەکانی مەدینەش بە نهێنی پەیمانیان لەگەل بت پەرستان مۆرکردوە لەسەر گەرانەوە وشەر نەکردن ئەوەبوو عەبدوللای کوری ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکان بەخۆی وبەسێ سەد سوارەوە گەرانەوە بۆ مەدینە بۆ ئەوەی موسولمانان وورەیان بروخێ وەبەهانەی ئەوەبوو کەشەر مەحالە رووبدات لەگەل قورەیشیەکان وە قورئانی پیرۆز مەبەستی دووڕووەکانی تۆمارکردووە کە دەفەرمووێ: ﴿.....قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ﴾ال عمران ١٦٧ .

واتە: (ئەگەر بمانزانیبایە شەر وجەنگ بەرپا دەبێت ئەوە شوێنتان دەکەوتین وە دەجەنگاین، ئەوانە ئەو رۆژە لەکوفرەوە نزیکترن تا لەئیمان، بە دەمیان شتێك دەلێن کە لەدلّ ودەروونیان وانیە خواش زانایە بەوەی دەیشارنەوە) (تەفسیری ئاسان ل٧٢)

وە موسلمانان گەیشتنە کێوی ئوحود ولەبەرامبەر سوپای بت پەرستان هەلیان دا وە پێغەمبەری خواش صەفی جەنگی رێك خستن وە پەنجا جەنگاوەری لەسەر کێوەکە دانا

که پێی دەڵێن (جبل الرماة) بۆ پشت ئەستوور بوونی موسلمانان وپاراستنی موسلمانان وە فەرمانی پێکردن بەهیچ شێوەیەك کێوەکە چۆل نەکەن ئەگەر موسلمانان چ سەرکەوتن چ ژێرکەوتن.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ سەربازەکانی رێکخست وە چاوی کەوت بەچەندان لە گەنج ومێرد منداڵان کە ئەوانیش هاتبوون بۆجەنگ وە ئەویش چاوپۆشی لەوانە کرد کەتەمەنیان لەپانزە سالان زیاتر بوو وە هەندێکی تری گێرایەوە بۆ دواوە کە تەمەنیان لە پانزە سالان کەمتر بوو لەبەر ئەوە ئەوان پێ یان ناخۆش بوو حەزیان دەکرد بەشداری بکەن، وە شەڕ دەستی پێکرد وە لەسەرەتایی شەرەکە موسلمانان سەرکەوتن وە لەو کاتە ئەوانەی لەسەرکێوەکە جێگیر بوون زانیان موسلمانان خەریکی تالان کۆکردنەوەن، لەسەر کێوەکە دابەزین وهەرچەندە سەرکردەکەیان عەبدوللای کوری جوبەیر زۆر پاڕایەوە لێ یان بەڵام بەگوێ یان نەکرد وەراسپاردەی پێغەمبەری خوای بۆ دووبارەکردنەوە کە فەرمووی: بە هیچ شێوەیەك لەسەر کێوەکە دامەبەزن، وە دابەزین تەنها عەبدوللا وچەند کەسێ مانەوە، وە لەم کاتەدا خالیدیکوری وەلید کە هێشتا موسلمان نەبوو بوو سەرکردەی قورەیش بوو بە هەلی زانی کەوا کێوەکە چۆڵ بوو لەپشتی کێوەکە بەسەر کێووەکە کەوت وپەلاماری ئەم چەند سوارەی داو دوای شەرێکی توند توانی سەرکەوێ وپشتی موسلمانان بشکێنێ لە پاش سەرکەوتن دۆراندن بوو بە بەشیان وە موسوڵمانان شپرزەبوون وهەرکەسێ بەلایەکا رایان کرد تەنها کەمێ نەبێ کە لە چوار دەوری پێغەمبەری خوا ﷺمابوو کە ئەوە کەبانگەوازی دەکرد ئەی موسوڵمانینە من ماوم وەرن بۆلام وە لەوانەی کە لەچوار دەوری پێغەمبەری خوا شەریان دەکرد دایکی عومارە (ام عمارة) بوو کە بە تیرو کەوانەکەی پارێزگاری لە

پێغەمبەر دەکرد ئەبو دوجانەش لاشەی خۆی ئەدا بەرتیرو شیری قورەیش نەبادا بەر پێغەمبەری خوا بکەوێ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بریندار بوو وە ددانی پیرۆزی شەهید بوو خوێنیان لێ دەتکا وەکەوت بەزەوی دا وە لەکۆتایی شەڕەکە کە شەڕ راوەستا دیتیان لەموسلمانان حەفتا کەس شەهید بوو ژمارەیەکی زۆریان لێ بریندار بوو وە لەقورەیش وبت پەرستانیش بیست ودووکەس کوژران وەقوریشەکان زانیان تۆڵەی خۆیان کردەوە کە لە بەدر بەسەریان هاتبوو وەئەبوسوفیان راوەستا بەدەنگی بەرز ووتی (اعلُ هُبُلَ) واتە بتە گەورەکە کە ناوی هوبەل بوو بەرزوو پیرۆزە، موسڵمانان وەلامیان دایەوە ووتیان خودا بەرز وپیرۆزە ئەبوسوفیان ووتی ئێمە عوزامان هەیە ئێوە نیتانە، موسلمانان ووتیان خوا پشت وپەنامانە ئێوە پشت ووپەناتان نیە ئەبو سوفیان ووتی ئەمرۆ بە رۆژی بەدرە وە شەریش بەنۆبەیە.



وه بت پەرستەکان گومانیان وابوو کەپێغەمبەریش کوژراوه وه ئەبوو سوفیان ووتی موحمەدمان کوشتووه عومەری کوری خەطاب وەلامی دانەوه کە پێغەمبەر زیندووه وگوێ ی لەدەنگتانه وەکافرەکان گەڕانەوه بۆ مەککە بەلێنیان دا کە سالی ئاینده بێنەوه بۆ بەدر وشەڕ بکەن وموسلمانان گەرانەوه بۆ شاری مەدینە وه پاش ئەوەی شەهیدەکانیان لە نزیك کێوەکە ئەسپاردەی خاك کرد کە لەوانە حەمزەی کوری عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەر بوو دوایی بریندارەکانیان تیمارکرد وموصعەبی کوری عومەیریش لە شەهیدان بوو.

## هەڵسەنگاندن

1. ڕوونی بکەرەوە کە کاریگەری هاوپەیمانی نێوان دووڕووەکان وبت پەرستان لەجەنگی ئوحود چۆن بوو؟

2. ڕوونی بکەرەوە چۆڵ کردنی کێوەکە چ تەئسیرێك کەوت بە موسلمان لەم جەنگەدا ؟

3. چەماوە بکێشە بە وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە ؟

١ ـ لەو کاتەی کافرەکان لەجەنگی بەدر ژێرکەوتن

أ ـ هەولیان دا بە ئاشت بوونەوە لەگەڵ موسڵمانان.

ب ـ چاوەروانی هاتنی کاروان بوون بۆ کۆمەك کردنی شەڕ لەگەڵ موسڵمانان.

ج ـ پەیوەندیان بە ڕۆم کرد بۆ یارمەتی دژی موسلمانان.

4. نیشانەی ڕاست (√) بەرامبەر ڕستەی ڕاست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ .

أ ـ ژمارەی موسلمانان لە ئوحود حەوت سەد شەر کەربوون.

ب ـ موسلمانان لە ئوحود حەفتا کەسیان لێ شەهید بوو.

ج ـ پێغەمبەری خوا چاوپۆشی کرد لەوانەی تەمەنیان لە پانزە ساڵ کەمتر بوو بە بەشداری کردن لەشەردا.

د ـ پێغەمبەر بریندار بوو لە جەنگی ئوحود.

هـ ـ عەباسی مامی پێغەمبەر لە جەنگی ئوحود شەهید بوو.

## وانەی حەڤدەهەم

# دەرکردنی هۆزی بەنی نەزیری جولەکە



یەکێك لەو موسڵمانان رزگاری بوو لە قەسابخانەی بیری مەعونە کە بت پەرستان دایان مەزراند بۆ موسلمانان لە رێگادا گەیشت بە دووکەس وای زانی کەئەم دووکەسە لەو هۆزە بوون کەموسلمانەکانی شەهید کردووە وەهەڵسا هەردووکیانی کوشت وە کە گەڕایەوە بۆ مەدینە پێغەمبەری خوایان ئاگەدار کرد بەم کارە ئەویش هەوڵی دا کەڕاستی رووداوەکە بزانێ دوای روون بوویەوە کە ئەم دوو کەسەی کە کوژراون بە هەلە کوژراون وە پێغەمبەری خوا چوو بۆ ناویان وەکە جولەکەی بەنی نەزیر بوون وهاووپەیمانی موسڵمانان بوون بۆ پێدانی خوێنی دوو کوژراوەکە لەگەڵیان دانیشت و وتووێژی کرد لەپاش جەنگی ئوحود بەلاَم جولەکەکان رق وکینەیان لە دلاَدا مابوو

بەرامبەر موسڵمانان وە لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پەنای خانوویەك وەستابوو جولەکەکان بە هەڵیان زانی کەوا فورسەتە وجارێکیتر وا رێك ناکەویٚ یەکێك بنێرین بچیٚ بۆ سەربانی خانوەکە وبەردێکی گەورە بەرداتەوە خوارەوە سەر سەری پێغەمبەر وبیکوژیٚ، وە خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کرد لەم پیلانە دەرحال لەشوێنی خۆی هەڵسا وهاتەوە مەدینە پیلانەکەیان پوچەل بۆوە وە پێغەمبەر ﷺ داوای لەموسلمانان کرد دەرحال سوپا ئامادەبێت بۆ سەر جولەکەی بەنی نەزیر چونکە پەیمانی خۆیان شکاندبوو وە پیلانیان دانابوو بۆ کوشتنی پێغەمبەرﷺ وە موحەمەدی کوری مەسلەمەی نارد بۆ لایان وفەرمانی پێکردکەوا دەبیٚ هەرچی زووە لەم شارە باربکەن وبڕۆن وە مۆڵەتی دە رۆژی پیٚ دان بۆ بارکردنیان وە لەسەرەتاوە جولەکەکان وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەریان داوە بەڵام عەبدوللای کوری ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکان فریوی دان وبەڵێنی پشت گیری خۆی پیٚ دان کە دەرنەچن ویارمەتیان بدات وە حویەی کوری ئەختەب سەرکردەی جولەکەکان پیاوێکی نارد بۆ لای پێغەمبەر ووتی پیٚ ی بلیٚ ئێمە لە ماڵ وحاڵی خۆمان دەرناچین چی دەکەی بیکە، وە پێغەمبەر فەرمانی بە سوپای ئیسلامی دا کە بچن بەرەو رووی قەلای جولەکەکان وە چوار لایان لیٚ بگرن زیاتر لە پانزە رۆژ.

وە جولەکەکان چاوەنواری هاتنی کۆمەك بوون لە عەبدوللای کوری ئوبەی کوری سەلول سەرۆکی دووڕووەکان وقورەیش وجولەکەکانی تر بۆ کۆمەکیان، بەڵام نەهاتن وە ئەم ئابلۆقەیە لەسەریان قوورس بوو وە خوای گەورە ترس وبیمی خستە ناو دڵیان وە ناعیلاج بوون خۆیان دا بەدەستەوە داوایان لەپێغەمبەر کرد کەرِیٚ یان بدات مەدینە جێبهێڵن وە ئەو ماڵ وسامانەی کەبەسواری دەتوانن بیبەن با بیبەن وە پێغەمبەری

خواشﷺ ئیزنی دان تەنها بێ چەك بڕۆن وە هەڵسان دەستیان كرد بەتێكدانی خانووی خۆیان پێش ئەوەی دەرچن وە دەرگاو پەنجەرەیان لەسەر پشتی ئیسترەكانیان دانا وڕۆیشتن وە قورئانی پیرۆز ئەم باركردنەمان بۆ تۆمار دەكات ودەفەرمووێ:﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ٢ ﴾الحشر ٢ واتە: ئەو خوایە ئەو زاتەیە ئەوانەی بێ باوەر بوون لە خاوەنانی كتێب، هەڵیكەندن لەشوێنەواریان وناچاری كۆچی كردن لەیەكەم دەست پێكردنی كۆكردنەوە ودەركردنیاندا، ئێوە بەتەما نەبوون وگومانتان نەدەبرد ئاوابە ئاسانی برۆن وئەوانیش گومانیان وابوو كە بەڕاستی قەلاكانیان بەرگریان دەكرد لەویست وفەرمانی خوا، ئەوسا ئیتر لەلایەكەوە خوا بەڵای بەسەر هێنان كەبەخەیاڵیاندا نەهاتبوو وە حیسابیان بۆ نەكردبوو ئەوسا خوا ترسێكی فرێدایە دڵیانەوە بە ناچاری دەستیان كرد بە كاولكردنی خانوبەرەو ماڵەكانیان بەدەستی خۆیان ودەستی ئیمانداران كەواتە ئەی خاوەن بیرو هۆش ودووربینەكانیان دەرس وپەندی لێوەرگرن (تەفسیری ئاسان ل ٥٤٥) وە هەندێكیان روویان كردە خەیبەر وهەندێكیان باریان كرد بۆ شام.

## هەڵسەنگاندن

١ چی بووە هۆی چوونی پێغەمبەر بۆلای بەنی نەزیر ؟

٢ ئەو پیلانە چی بوو کەجولەکەکان دایاننابوو بۆ کوشتنی پێغەمبەر ؟

٣ چەماوە بکێشە بۆ بەرامبەر وەلامی راست .

١ ـ لەو کاتەی خوای گەورە پیلانی بەنی نەزیری ئاشکرا کرد بۆ پێغەمبەر

أ ـ جولەکەکان زانیان کە پێغەمبەری خوایە وموسلمان بوون

ب ـ لە ترسی پێغەمبەر باریان کرد بۆ مەدینە.

ج ـ بەردەوام بوون لەسەر کافربوون وخۆیان قایم کرد لە قەلاکانیان.

٢ ـ لەو کاتەی پێغەمبەر داوای لەبەنی نەزیر کرد بۆ بارکردن

أ ـ دووڕووەکان بەڵێنی سەر خستنیان دان بەلام پەشیمان بوونەوە.

ب ـ دووڕووەکان سوپای کۆمەکیان نارد بۆ شەرکردن لەگەلیاندا

ج ـ جولەکەی بەنو قورەیزە یارمەتیاندان.

٤. ڕستەیەك لەستونی أ بگەینە رستەی گەنجاو لەستونی ب

| ـ أ ـ | ـ ب ـ |
|---|---|
| پێغەمبەر مۆلەتی دا بە بەنو نەزیر بۆ بارکردن | نزیکەی پانزە رۆژ |
| ئابلۆقەی موسلمانان بۆ بەنو نەزیر درێژەی بووتا | خەیبەر وشام |
| بەنونەزیر چوون بۆ | دە رۆژ |

## وانەی هەژدەهەم

# جەنگی خەندەق (د)ی كۆچی



### هاندانی جولەكەكان

جولەكەی بەنو نەزیر نەوەستان بە دوژمنایەتی یان

بۆ ئیسلام ئەوە بوو پاش دەرچوونیان لەمەدینە هەڵسان بە هاندانی دوژمنانی ئیسلام بۆ سەر ئیسلام وە داگیركردنی مەدینە ودەست بەسەر موسڵمانان دابگرن ولـەناویان ببـەن ئەوەبوو وەفدێكیان ناردە شاری مەككە بەسەرۆكایەتی حویەی كوری ئەختـەب وەهـاتن بە هاندانی قورەیشیەكان لەسەر شەركردن لەگەلیان دا وە بەلێنی پـارە ومالیـان دا پـێ یان وە لەپاشان چوون بۆ لای هۆزی غەطەفان كە پەیمانیان لەگەل پێغەمبەر دابـوو كـە یارمەتیان بدەن بۆ شەڕكردن ئەوانیش وەكو قورەیشیەكانی مەككە بەلێنی مال وسامان وسەربازیان پێ دان كە پێكەوە پـەلاماری مەدینـە بـدەن وە خـەریكی خـۆ ئامـادەكردن بوون وە بە سوپایەكی بەهێزەوە وویستان بەرەو مەدینە بچن.

## هەڵکەندنی چاڵ:

لەوکاتـەی کـە موسـلمانان نیـازی پـەلاماری جولەکـە وبـت پەرسـتانیان زانـی خۆیـان ئامادکردوقایم کـرد لەشـاری مەدینـەی پـیرۆز وە بـۆ خـۆ قـایم کـردن، هـاوەڵی بـەرێزی پێغەمبەر سەلمانی فارسی کە ئاماژەی بەوەدا کە پێویستە چـاڵێکی قـوول لـە بـاکوری مەدینە هەڵـکەتن کە ڕێگای تێپەربوونی سوپا بوو بۆ ناو شاری مەدینە بگـرێ وە لاکـەی تری شاخ وکێو بوو وەلاکەی تری دارخورما وبـاغ وبێسـتان بـوون وەموسـلمانان بەپەلـە هەڵسان بە لێدانی چاڵ وە پێغەمبەری خواش خۆی بەشداری ئەم کارەی دەکرد وپـێش هاتنی سوپای کوفر چاڵەکەیان تەواو کرد

## ئابلوقەدان:

سـوپای بـت پەرسـتان گەیشـتە سـنوری مەدینـە لـەلای چـاڵەکە (خەنـدەق) هـەوڵیان داوکەژمارەیان چوار هەزار شەڕکەر دەبوو وە سوپای بەنی غەتەفانیش ژمارەیان شـەش هەزار دەبوو وە ژمارەی موسلمانان سێ هەزار بوو وەتـیر هاویشـتن لـەنێوانیان دەسـتی پـێ کـرد وە ژمارەیـەکیان لـە بـت پەرسـتان وویسـتیان لـە چـاڵەکە بـدەن وبپەڕنـەوە لەبەرامبەردا سوپای ئیسلام هەڵمەتیان بۆ بردن وتێکیـان شـکاندن هەنـدێکیان کـوژران وهەنـدێکیان هـەلاتن وە جولەکـەی بـەنو نـەزیر بەمـەوە نەوەسـتان بـەلکو پەیوەنـدیان بەجولەکەی بەنو قورەیزەی ناو شاری مەدینە کرد وداوای یارمەتی وکۆمەکیان لێ کردن وە ئەوانیش ڕازی بوون وپەیمانیان لەگەڵ موسلمانان شکاند.

وە خوای گەورە لەم چەند ئایەتە ئەمەمان بۆ روون دەکاتەوە کە دەفەرمووێ:

﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ ﴾

الاحزاب ١٠-١١.

واتە: کاتێك دوژمنان لەسەرو خوارتانەوە هاتنە سەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبلەق بوون، دڵەکان گەشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بە بەڵێنەکانی خوای گەورە (بە سەرکەوتنی ئیمانداران) لەوێ دا ئیمانداران تاقی کرانەوە وە تووشی تەنگانە وسەختیەکی زۆر توند وبەهێز بوون توشی دڵە لەرزەیەکی زۆر سەخت بوون (تەفسیری ئاسان ل ٤١٩).

ئەوانەی لەسەرەوەی خۆیانەوە هاتن جولەکەی بەنو قورەیزە بوون وە ئەوانەی لەخوارەوە هاتن قورەیش وغەتەفان بوون وەعەبدوللای کوری ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکان هەلسا بە نانەوەی پەشێوی وترس لە دڵی موسلمانان وە بلاوکردنەوەی وورە رووخاوی وە وایان دانا کە ئەم شەرە زۆر بەهێزە وە سەرجەم موسلمانان شکست دەهێنن وە لەبەر ئەمە خۆیان بۆ پاشەکشە ئامادەکرد وگەرانەوە بۆ مالەوە بەشداریان نەکرد.

## شەر فێل وتەلەکەیە:

کەمتر لەمانگێك بوو موسلمانان لە شاری مەدینە ئابلۆقە درابوون، وە موسلمانان ترسان لەوەی دوژمن پێ بنێتە نێو شاری مەدینە وە ترسان لە بەنوقورەیزەش کە پەیمانیان شکاند وە خوای گەورە خۆشی ودڵ ئارامی بە موسلمانان بەخشی لەوکاتەی نوعەیمی

کوڕی مەسعود هاتە شاری مەدینە وکە لە هۆزی غەتەفان بوو وە موسلمانی بوونی خۆی ئاشکرا کرد وبووە سەربازێکی نەناسراو بۆ ئیسلام وە پێغەمبەری خواش فەرمووی: چی لەدەستت دێت بیکە چونکە شەڕ فێڵ وتەڵەکەیە بەڵام هۆزەکەی نەیان زانی موسلمان بووە، چوو لای هۆزی بەنوقورەیزە چونکە دۆستایەتی لەگەڵیان هەبوو دلسۆزی بۆیان نواند ئاگاداری کردنەوە لەوەی پاش گەزیوینەوە لەگەڵ موحەمەد ومەبادا پاشان موحەمەد چیتان لێ دەکات کاتی قورەیش وغەتەفان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان وئێوەش لەمەدینەن دەکەونە بەردەستی پێغەمبەر من وای بەچاك دەزانم ئێوە لەقورەیش دلوای بارمتەی چەند پیاوێ بکەن، لەقورەیش و غەتەفان بۆئەوەی گیانی ئێوەش سەلامەت بکەن کاتێ موحەمەدبە سەرتان زاڵ دەبێت لەپاشان نوعەیم چووەلای قورەیش وپێ ی ڕاگەیاندن کەوا بەنوقوریزە پاش گەزیوونەوە ئەوە لەگەل موحەمەد دا پەیمانیان بەستووە وە ئێستا بەتەمان دلوای بارمتە لە قورەیش وغەتەفان بکەن وە تەسلیمی موحەمەدی پێ بکەن وپاکانەی خۆیان دەریرن لەپاشان بە هۆزی خۆی کە غەتەفان بوو ووت.

وە قورەیش وغەتەفان پەیوەندیان بە بەنوو قورەیزە وە کرد دلوایان لێ کردن کە بەشداری جەنگ بکەن بەڵام ئەوان دلولکاریان هەبوو ئەویش ئەوەبوو دلوای بارمتەی لێ کردن ئا لەم کاتەدا قورەیش وغەتەفان زانیان ووتەی نوعەیم ڕاستەوە ئەم کارەی نوعەیم بوە هۆی نانەوەی ئاژاوەشەڕ لەنێوان بت پەرستان وجولەکەی بەنوقورەیزە بەشکستی بت پەرستان دوایی هات.

**سەرکەوتنی خوایی:**

پێغەمبەر وهاوەلان زۆر نزاو پارانەوەیان کرد کە خوای گەورە دەرووی رەحمەتیان لێ بکاتەوە لەم ئابلۆقەیە رزگاریان بێت، وە خوای گەورە نزای گیرا کردن وبایەکی بەهێزی زاڵ کردن بەسەر بت پەرستان هەتا وای لێ هات چادر وخێمەیان کەوتە شلەژان ومەنجەلی چێشتیان کەوتە لەرزین وسەرما وسۆلەو بای بەهێزی بۆ ناردن وە خوای گەورە ترس وبیمی خستە دڵیان وە بانگی یەکتریان دەکرد وگەرانەوە بۆ مەککە وە خوای گەورە نەصرەت وسەرکەوتنی بەخشی بەموسلمانان وە خوای گەورە ئەم باسەی لە قورئانی پیرۆز تۆمار کردووە کە دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ٩ ﴾ الاحزاب ٩.

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمان وبرواتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە) کە خوای گەورە فریای ئیمانداران کەوت، کاتێك سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان، ئێمەش رەشەبایەکی بەهێز وسەربازانێکمان ناردە سەریان کە نەتاندەبینین، خوای گەورە بینایە بەهەوڵ وکۆششتان چۆن پاسەوانیتان دەکرد چۆن ئەوچالە قول ودرێژەتان هەڵکەند ....) تەفسیری ئاسان ل٤١٩ وە موسلمانان بڕوایان زیاتر بوو بە سەرکەوتنی خوا، وە دووڕووەکان زەلیل وسەرشۆڕ بوون وە دوژمنایەتی بەنو قورەیزەش ئاشکرابوو بۆ موسلمانان هەروەکو بەنو نەزیر وبەنو قونەیقاع لەپەیمان پاشگەز بوونەوە.

## سوودێك

ئەم جەنگە ناونرا بەجەنگی خەندەق (چاڵ) چونكە موسلمانان چاڵیان لەمەدینەلێ داو هەتاكو دوژمنان نەتوانن بپەڕنەو بۆ شار، وەناوی جەنگی ئەحزابیشە چونكە هەموو كۆمەڵ وحیزبەكان بەشدار بوون لەم جەنگەو سورەتی ئەحزاب ئەم ڕووداوەی تۆماركردوە.

## هەڵسەنگاندن

١ ڕۆڵی جولەكەی بەنو نەزیر ڕوون بكەوە لە جەنگی خەندەق ؟

٢ ڕۆڵی دووڕووەكان چی بوو لەم جەنگە ؟

٣ چەماوە بكێشەبەدەوری وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە ؟

١ ـ موسولمانان خۆیان ئامادە كرد بۆ گەیشتن بە قورەیش وغەتەفان

أ ـ بە دەرچوون بۆ كێوی ئوحود

ب ـ بە لێدانی چاڵ وخۆقایم كردن لەمەدینەدا.

ج ـ بەناردنی وەفدێك بۆ ئاشتی كردن.

٢ ـ ڕۆڵی بەنو قورەیزە لە جەنگی خەندەق ئەمەبوو

أ ـ بەشداری كردن لەگەڵ موسلمانان بۆ پارێزگاری مەدینە

ب ـ پەیمان شکاندن لەگەڵ موسلمانان.

ج ـ مانەوە بێ لایەن.

٣ ـ ڕۆڵی نوعەیم کوری مەسعود لە جەنگی خەندەق

أ ـ ئاشکرا کردنی شەر لەسەر هۆزی غەتەفان

ب ـ فێل وتەڵەکە لە نێوان بەنو قورەیزە وقورەیش وغەتەفان

ج ـ نانەوەی فیتنەو ئاژاوە لەنێون هۆزی خۆی وکشانەوەی لەشەردا.

٤ کۆتایی هات ئابلۆقەی بت پەرستان لە مەدینە.

أ ـ بە ڕۆیشتنی موسلمانان بۆ شەرکردنیان.

ب ـ کشانەوەیان لەمەدینە بەهۆی بایەکی بەهێز

ج ـ ڕوودانی ئاژاوە لەنێوان قورەیش وغەتەفان

وانەی نۆزدەهەم

# جەنگی بەنی قورەیزە

پێغەمبەری خوا وموسلمانان گەرانەوە ماڵی خۆیان پاش ڕۆیشتنی سوپای ئەحزاب وە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگابوو بۆ ماڵەوە یەکسەر جوبرائیل (علیه السلام) هاتە لای فەرمووی ئەی پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە فەرمانت پێدەکات کە دەرحاڵ دەرچن بۆ جولەکەی بەنو قورەیزە وە پێغەمبەری خوا بانگەوازی موسڵمانانی کرد بۆ شەرکردن لەگەڵ بەنو قورەیزە و فەرمووی با کەستان لێرە نوێژی عەسر نەکات هەتا لە بەنو قورەیزە نەبێ واتە پەلە بکەن بۆ چوون بۆلایان.



هۆزی بەنو قورەیزە ناپاکیان ئەنجام دا بەرامبەر موسڵمانان لەوکاتەی پەیمانیان شکاند ویارمەتی سوپای ئەحزابیان داکەوا ئابلۆقەی شاری مەدینەیان دا وە پێویست بوو تۆڵەیان لێ بسەنرێ چونکە ویستیان ژیانی موسلمانانی مەدینە بخەنە مەترسیەوە، لەوکاتەدا کە

سوپای بەنو قورەیزە چاویان بە سوپای ئیسلام کەوت خزانە ناو قەلاکانیان وخۆیان قایم کرد وە موسڵمانان بیست وپێنج شەو ئابلۆقەیان دان، وە لەنێوان خۆیان کۆبونەوەیەکیان گرێ دا بە سەرۆکایەتی گەورەکەیان کەعبی کوری ئەسەد وە ئەویش سێ هەڵی لەپێش دانان کە ئەمانە بوون:

١ - یان تەسلیم بوون خۆبەدەستەوەدان وموسڵمان بوون وە دەیانزانی موحەمەد پێغەمبەری خوایە.

٢ - یان هەرکەسەو مال ومنالی خۆی بکوژێ ودوایی دەرچن بۆ شەڕی مان ونەمان.

٣ - یان لەناکاو هێرش بکەینە سەر موسلمانان لەشەوی شەمە کەوا موسلمانان دەزانن ئێمە لەم شەوەدا شەڕناکەین بەناکاوی هێرش بکەین زەبری گەورەیان لێ بوەشێنین.

وە بەنوقورەیزەیەکان ئەم پێشنیارانەی کەعبی کوری ئەسەدیان رەتکردەوە وئەم ئابلۆقەیە تەنگی پێ هەلچنین بەڕۆیشتنی کات وسات دانوستان لەنێوان موسلمانان وبەنی قورەیزە دەستی پێکرد وەهاوپەیمان هەبوون لەنێوان ئەوس وبەنی قورەیزە لەسەردەمی نەفامی دا وە وایان دانا کە پێغەمبەر مامەلەی چاك لەگەل بەنو قورەیزە دەکات هەروەکو مامەلەی لەگەل هاوپەیمانی خەزرەجیان کرد کە بەنو قونەیقاع بوون وە هەندێك لە گەورەکانی ئەوس وتووێژیان لەگەل پێغەمبەر کرد ئەویش فەرمووی ئایا رازی دەبن یەکێك لەئێوە بڕیار بدات لەسەر بەنو قورەیزە ئەوانیش ووتیان بەلێ رازین فەرمووی ئەوە سەعدی کوری مەعازە وە سەعدی کوری مەعاز لەجەنگی خەندەق بریندار بوو بەهۆی تیرێك وە برینەکەی سەخت بوو وە داوای لەخوا کرد بە پلەی شەهیدی بگەیەنێ ئەگەر شەر رووی دا لەنێوان قورەیش وموسلمانان وە خوا نەیکوژێت

تاكو تۆله له بەنوقورەیزە دەكاتەوە بەهۆی ناپاكی و خیانەتیان، پێغەمبەری خوا لەناو مزگەوتی مەدینە خێمەی بۆ هەلدابوو وە بۆ ئەوەی لە پێغەمبەر ﷺ نزیك بێت، وەئەوەبووسەعدی كوری مەعازیان بەسواری ئێسترێك هێنا بۆلای بەنو قورەیزەی ئابلوقەدراو وە هەندێك پیاوی هۆزی ئەوس هاتنە پێش داوای لێ كرد لەگەل بەنو قورەیزە باش بێت وە پێغەمبەری خواش مۆلەتی دا كە بەحوكمی ئەو رازی بن ئەویش حوكمی كرد بەكوشتنی پیاوەكانیان وە جیاكردنەوەی ماڵ ومناڵەكانیان وەماڵ وسامانیان دابەش بكرێت مەگەر كەسێ بروا بهێنێت وموسڵمان بێ وە پێغەمبەریش هاورابوو لەگەل ئەودا وە روونی كردەوە كەوا حوكمت كرد بەفەرمانی خوای گەورە لە سەرووی حەوت قاتی ئاسمان.

## هەڵسەنگاندن

١- بۆچی موسلمانان پاش ئەحزاب چوونە بەنو قورەیزە ؟

٢- ئەو هەڵ ومەرجە چی بوو کە کەعبی کوری ئەسوەد بۆ بەنو قورەیزەی پێشنیار کرد بۆ کۆتاهێنان بە ئابلۆقەدان ؟

٣- نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ - هۆزی ئەوس داوایان لەپێغەمبەر کرد مامەلە لەگەل بەنو قورەیزە بکات بە باشی.

ب - سەعدی کوری موعاز بریندار بوو بە سەختی لەجەنگی ئوحود.

ج - سەعدی کوری موعاز حوکمی کرد بە کوشتنی پیاوەکانیان ودیل گرتنی ئافرەتانیان.

د - سەعدی کوری موعازحوکمی لەگەل حوکمی خوا هاورابوو.

ه- سەعدی کوری موعاز حوکمی کرد بەدەرکردنی بەنو قورەیزە لەمالەکانیان.

## وانەی بیستەم

# ئاشت بوونەوەی حودەیبیە لەساڵی ٦ کۆچی



پێغەمبەر ﷺ خەوێکی بینی کە لەو خەوەیدا دەچێتە مزگەوتی حەرام لە مەککە تەواف دەکات بەدەوری کەعبەی پیرۆز وە ئەم خەوەی بۆ هاوەڵان گێڕایەوە وە بڕیاری دا لەمانگی زولقیعدەی ساڵی شەشەمی کۆچی دەچێتە عومرە وبۆیە جاڕی دا بەنێو موسلمانان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ عومرە وزیارەتی کەعبەی پیرۆز لەگەلی دا . وە خۆی جلی ئیحرامی پۆشی لەگەڵ موسلمانان بۆ ئەوەی خەلکان بزانن ئەو بۆ شەر ناچێ ودەیەوێ زیارەتی مالی خوا بکات وەلەگەڵ خۆشیان دا تەنها چەند شیرو تیرێك هەبوو لە ناوکێلانەکانیان دابوو وە ژمارەیان هەزار وچوارسەد کەس دەبوون.

وه قورەیشیەکان بەهاتنی پێغەمبەریان زانی بەرەو مەککە وەخۆیان ئامادە کرد بۆ بەرەنگار بوونەوە ونەهێشتنی هاتنی بۆ مەککە وە بڕوایان نەکرد کە ئەو هاتووە بۆ عومرە وبەئاشتی بێ شەر بەڵام وایان گومان برد کە هاتووە بۆ شەرکردن.

وەپێغەمبەری خواﷺ لەشوێنێکی نزیك مەککە دابەزی کە پێی دەڵێن حودەیبیە وە قورەیشیەکان چەند کەسێکیان ناردە لای پێغەمبەر بۆ زانینی نیازی هاتنی بۆ مەککە وە یەك لەدوای یەك دەگەڕانەوە بۆ مەککە رایان دەگەیاند کەوا وەلامیان ئەوەبوو موحەمەد نەهاتووە بۆ شەڕ تەنها هاتووە بۆ زیارەتی کەعبەی پیرۆز بۆ عومرە.

وە پێغەمبەر ﷺ عوسمانی کوڕی عەففانی نارد بۆ لای گەورە گەورەکانی قورەیش بۆ ئارام کردنەوەی دڵەکانیان بۆ نەهێشتنی ترس لەدڵیان، وە عوسمان چووە مەککە وئەو پەیامەی کەپێیان دابوو رای گەیاند کە موحەمەد نەهاتوە بۆ شەر بەلکو دەیەوێ عومرە بکات وە ئەوانیش بە عوسمانیان ووت رێگا بۆ تۆ هەیە کە عومرە وتەوافی مالی خوا بکەی بەتەنیا ئەویش رەتی کردەوە تاوەکو لەگەل پێغەمبەری خوا نەبێت تەواف ناکات وعوسمان لە مەککە زۆر دواکەوت وە دەنگۆیەك بلاوبۆوە کە عوسمان لە مەککە کووژراوە وە لەم خەفەتەدا پێغەمبەری خوا دەرحاڵ داوای لەموسلمانان کرد کە پەیمانی بدەنێ لەسەر شەر وپشت نەکردن لێی ئەگەر شەڕ روووی دا وە قورئانی پیرۆز ئەم پەیمانەی تۆمارکردوە کە دەفەرموێ.﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾ الفتح ١٨

واتە: ﴿سوێند بەخوا بەڕاستی خوا رازی بووە لەو باوەردارانەی کاتێك پەیمانیان لەگەلدا بەستیت لەژێر درەختەکەدا خۆیشی ئاگاداربوو بەوەی لە دڵەکانیان هەیە (لە نیاز پاکی

ودڵسۆزی) هەربۆیە ئارامی وهێمنی وئاسوودەیی دابەزاندە سەریان وپاداشتی بە مژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە﴾ تەفسیری ئاسان ل ٥١٣

لەپاشان روون بۆوەکە عوسمان نەکوژراوە وزیندووە وە قورەیشیەکان سوهەیلی کوری عەمریان ناردە لای پێغەمبەر کە دانوستان بکەن لەگەڵی داوە ئەم دانوستانە دوایی هات بە بەستنی پەیمانی ئاشتی حودەیبیە کە بەندەکانی ئەمانە بوون:

١ ـ وەستانی شەر لەنێوان موسلمانان وقورەیش بۆ ماوەی دە ساڵ.

٢ ـ گەڕانەوەی موسلمانان ونەکردنی عومرە وساڵی ئایندە بێن بۆ عومرە کردن.

٣ ـ کردنەوەی وریدانی هۆزەکانی عەرەب چ لەگەل قورەیش چ لەگەل موسلمانان بەپەیمان بەستن.

وە بەراستی پەیمانی ئاشتی حودەیبیە لەنێوان موسلمانان وقورەیش فەتح وسەرکەوتنێکی گەورە بوو تا ئەم کاتە ئەوجا قورەیش دانی نا بە بوونی موسلمانان وبووە هۆی کرانەوەی دەرگا بەرووی هۆزەکانی عەرەب کە بێنە ناو ئیسلام وە هەر لەم پەیمانەش سورەتی فەتح دابەزی وە خوا دەفەرموێ:﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾﴾ الفتح ١-٣

واتە: ﴿ئەی پێغەمبەرﷺ بەراستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت (مەبەست سەرکەوتنی حودەیبیە بوو) کە لەنێوان موسلمانان وقورەیش رووی دا هەرچەندە لەرووالەتدا زەرەری بۆ ئیمانداران بوو بەلام هەر هەمووی گەڕا بەخێر وسەربەرزی بۆ موسلمانان (١) تا خوا لەهەموو گوناهەکانی رابردوو ئایندەشت خۆش بێت وبەخشینەکانی لەسەرت تەواو بکات وبتخاتە سەر رێگەی راست ودروست (٢) تا

بەم بۆنەیەوە خوا سەرکەوتنێکی بەهێزو بالآت پێ ببەخشێت (٣)﴾(تەفسیری ئاسان ل٥١) وە صولحی حودەیبیە فەتح وکرانەوە وسەرکەوتنێك بوو بۆ موسلمانان کە بەهۆیەوە رێخۆش کەر بوو بۆ بلاوبونەوەی ئیسلام وبووە هۆی موسلمان بوونی زۆربەی خەڵکی مەککە وقورەیش وکۆتایی هات بە خاوێن کردنەوەی مەککە لەدەست بت پەرستان و بت وبتخانە وە خەلکی بەکۆمەل هاتن بۆ ناو ئیسلام.

## هەڵسەنگاندن

١. ئەو خەوە چی بوو کە پێش صولحی حودەیبیە پێغەمبەر دیبوی ؟

٢. پێغەمبەری خوابەرەو کوێ بەرێکەوت بۆ عومرە ؟

٣. قورەیش چۆن پێشوازی دەنگۆی هاتنی پێغەمبەریان کرد بۆ مەککە ؟

٤. نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ:

أ ـ قورەیش چەند کەسانێکیان نارد بۆ وەرگرتنی نیازی پێغەمبەر بۆ هاتن بۆ مەککە.

ب ـ پێغەمبەر عوسمانی ناردە مەککە بۆ دل ئارامی گەورە گەورەکانی مەککە.

ج ـ قورەیشیان عوسمانیان بەند کرد نەیان هێشت بگەرێتەوە بۆلای پێغەمبەر.

د ـ لەو کاتەی پێغەمبەر گومانی برد عوسمان کوژراوە پەیمانی لەگەل موسلمانان بەست.

هـ ـ لەبەندەکانی صولحی حودەیبیە موسلمانان رێیان پێدراوە کەعوومرە بکەن پاش مۆرکردنی.

و ـ صولحی حودەیبیە هەڵی رەخساند بۆ هۆزە عەرەبەکان کە پەیمان لەگەل قورەیش وموسلمانان ببەستن.

## وانەی بیست و یەکەم

## جەنگی مۆتە ( ٨ ی کۆچی )

پێغەمبەر ﷺ چەند نامەی نارد بۆ پاشاو مەلیکەکان وبانگی کردن بۆ بڕوا هێنان وموسڵمانان بوون ئەوەبوو حاریسی کوڕی عومەیری نارد بۆ پاشای بوسرا لەڕێگادا گەیشت بەوالی وسەرکردەی مۆتە ئەویش نامەی پێغەمبەری خوای پارچە پارچە کرد ونێردراوەکەی کوشت.

پێغەمبەری خواش ﷺ کە بەمەی زانی سوپایەکی سێ هەزار کەسی بۆ ناردن فەرمانی پێکردن کە بەرەو مۆتە بڕۆن وە بانگی خەڵکەکەی بکەن بۆ ئیسلام بوون وبڕواهێنان، وە ئەگەر بڕوایان نەهێنا ئەوا شەڕیان لەگەل بکەن وەپێغەمبەری خوا ﷺ سێ کەسی بۆ سەرکردایەتی ئەم سوپایە هەلبژارد لەم جەنگە دا کە ئەگەر زیدی کوری حارسە شەهید بوو با جەعفەر دانێن



وه ئەگەر ئەویش شەهید بوو با عەبدوللای کوڕی ڕەواحه دابنێن وپێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەرەوەی شار وخواحافیزی لەم سوپایه کرد وبەرێ ی کردن وه لەم کاتەدا عەبدوللای کوری رەواحه دەستی بەگریان کرد چونکه زانی لەم شەڕە کۆچی دوایی دەکات وبەپلەی شەهیدی دەگات بۆیه گریا وه پێغەمبەر پێ ی فەرموو: بۆچی دەگریت؟ ئەویش فەرمووی سوێندم بەخوا لەبەر دونیا ناگریم یان پەیوەستم بە دونیاوه بەڵام گوێم لەم ئایەته بوو کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم ٧١

واته: ئێوه خەلکینه کەستان نی یه تێپەر نەکات بەسەر دۆزەخ دا، ئیمان داران بۆ ئەوەی زیاتر قەدری بەهەشت وڕەحمەتی خوا بزانن، کافران بۆ ئەوەی بکەونه ناوی ئەم پێشهاته شتێکی بریاردراوه هەر جێ بەجێ دەرکرێت ) تەفسیری ئاسان ل٣١٠ وه من نازانم ئایا دەرباز دەبم لەدۆزەخ یان نا، وه سوپای ئیسلام بەرەو شام بەرێکەوت وکەگەیشتنه (مەعان) زانیان که دوژمن خۆی ئامادە کردوه بۆ شەڕ وه ئەوان سەد هەزار شەرکەربوون له ناوچەی (مەئاب) وه موسڵمانان راوێژیان به یەکتر کرد که چی بکەن وه هەندێکیان پیشنیاریان کرد کەوا نامەیەك بۆ پێغەمبەری خوا بنوسن لەباس وخواسی رۆمەکان ئاگاداربێ بەڵام عەبدوللای کوری رەواحه هانیدان بۆ شەڕ کردن وهەڵمەت بردن بۆ مۆته وه هەردوو سوپا گەیشتن به یەکدا که وەکو یەکتر نەبوون له چەك وتفاق دا بەڵام بەبڕوای پۆلاینەوه چوون بەرەو لەشکری خوا نەناسان هەروەکو عەبدوللای کوری رەواحه فەرمووی ئێمه شەڕ ناکەین بەژمارە وچەك وتفاقەوه بەڵکو بەم دینەوه شەڕ دەکەین که خوا رێزی لێ ناوین ئەوجا یەك لەم دوو شته بەنەسیبمان دەبێ یان سەرکەوتن یان شەهید بوون.

وە زەیدی کوری حاریسە سەرکردایەتی کردن وئالای پێغەمبەری خوای گرت بەدەستەوە شەڕی کرد شەڕێکی باش وهەتا شەهید بوو وە جەعفەری کوری ئەبوو طالبیش ئاڵاکەی هەلگرت وشەڕی کرد دوژمنان دەوریان داو وە لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و وەشەڕێکی بێ وێنەی کرد وئەم چەند دێرە شیعرەی دەگوتەوە:

یا حبذا الجنة واقترابها    طيبة وباردا شرابها

والروم روم قددنا عذابها    كافره بعيدة انسابها

علي اذ لاقيتها ضرابها

چەند خۆشە بەهەشت ونزیك بوونەوەی بۆنی خۆش وئاوی سازگار، وە رۆمەکان نزیك دەبنەوە لەم ئازارو سزای دۆزەخ بێ بڕوان دوور لە نەسەب وخزمایەتی وە ئەگەر بگەم بە دوژمنان لێیان دەدەم

وە شەڕی کرد هەتا قۆڵی ڕاستەی قرتا وە ئاڵاکەی بەدەستی چەپی گرت ودیسان لێیان داو قۆڵی تری قرتا وە ئاڵاکەی بە هەردووباڵی گرت وشەڕی کرد هەتا خوا پلەی شەهیدی پێ بەخشی وە خوای گەورەش بەم دوو قۆڵەی لەجیاتی دوو باڵی پێ بەخشی کە لە بەهەشت پێ بفرێ وە لەبەر ئەم هۆیە پێی وترا (جەعفەری طەیار) وە دوایی عەبدوللای کوڕی رەواحە ئاڵاکەی هەلگرت بوو بە سەرکردەی سوپا وشەڕی کردو هاواری کرد بۆ هاندان وخۆراگری موسلمانان وە شەڕی کرد وهەتا ئەویش بە پلەی شەهیدی گەیشت وئینجا موسلمانێ ئالاکەی هەلگرت وهاواری کرد ئەی موسلمانینە سەرکردەیەك بۆ خۆتان دیاری بکەن وە موسلمانان خالیدی کوڕی وەلیدیان کردە سەرکردەیسوپاوەخالیدیش وای بەچاك زانی پیلانێك دانێ بۆ کشانەوەی سوپای

ئیسلام وەگەڕانەوەی بۆ شاری مەدینە وە خوای گەورە ئەم هەواڵی جەنگەی بە پێغەمبەرەکەی ڕاگەیاند وەلەم کاتەدا کە سوپا گەڕایەوە بۆ مەدینە گەیشتن بە خەڵکانی نێو شار دەیان ووت ئەی هەلاتووەکان لەشەڕ، ئێوە ترسنۆکن هەڵاتوون، وە پێغەمبەری خوا فەرمووی نەخێر ئەوان هەلاتوو نین ئەوانە سەربەرزن کە خوا حەزبکات.
وە موسلمانان لەم سریەیەدا بەرامبەر سوپایەکی گەورە بوون وە خۆیان راگرت وە چەندەها کوژراویان لێ کردن وە تۆلەی نێردراوی پێغەمبەریان لێ کردنەوەو وەڕۆمەکان زانیان کە موسڵمانان سەربەرزن وژێر چەپوکی قەبوڵ ناکەن.

## هەڵسەنگاندن

١ هۆی چی بوو پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ڕێکخست بۆ مۆتە ؟

٢ ناوی سەرکردەکانی موسلمانان لە مۆتە باس بکە ؟

٣ بۆچی عەبدوللای کوڕی ڕەواحە گریا کە لە مەدینە دەرچوو ؟

٤ چەماوە بکێشە بەدەوری وەڵامی ڕاست.

أ ـ لەو کاتەی ڕۆمەکان زانیان موسلمانان بەڕێکەوتوون بۆ مۆتە

١ ـ سوپایەکیان کۆکردەوە ژمارەیان سەد هەزار کەس بوو.

٢ ـ نێردراویان ناردە لای پێغەمبەر بۆ دانوستان.

٣ ـ بەرەو مەعان چوون شەڕیان لەگەل موسلمانان کرد.

ب ـ لەوکاتەی موسلمانان زانیان ڕۆمەکان ئامادەی جەنگن

١ ـ گەڕانەوە بۆ مەدینە.

٢ ـ نامەیان نارد بۆ لای پێغەمبەر وئاگاداریان کرد.

٣ ـ بەرەو مۆتە ڕۆیشتن بۆ شەڕ کردن.

ج ـ لەوکاتەی سوپا گەڕایەوە لە مۆتە بۆ مەدینە

١ ـ خەلکەکە پێشوازیان لیّ کردن وبەخێرهاتنیان لیّ کردن.

٢ ـ ووتیان ئەی هەڵاتووەکان.

٣ ـ ڕێگریان لیّ کردن لەچوونی بۆ مەدینە.

## وانەی بیست و دووەم

# ئازادکردنی شاری مەککەی پیرۆز ساڵی ٨ی کۆچی

### پەیمان شکاندن

پـەیمانی حودەیبیـە هـەلێکی زێرینـی رەخسـاند بـۆ موسـلمانان کـە بەهۆیـەوە تـوانرا پەیوەندی بە چەند خەلکانێك بکرێـت وببنـە موسـڵمان، بـەهۆی دوورکەوتنـەوە لەشـەڕ، بەرووبوومەکان ئەوەبوو موسـڵمان بـوونی کۆمـەڵێ لـە قورەیشـیان وخـەلکانی تـری لـێ کەوتـەوەوەپاش دووسـاڵ لـە پـەیمانی حودەیبیـە قورەیشـیەکان پەیوەسـت بـوون بەپەیمانەکەوە بـەڵام لـە سـاڵی هەشـتەمی کۆچـی دا هـۆزی بـەنو بـەکر کـە هاوپـەیمانی قورەیش بوون وهەڵمەتیان برد بۆ هۆزی خوزاعە کە هاوپـەیمانی موسـڵمانان بـوون بـوو بەشەڕ لەنێوانیان داو قورەیشیەکانیش چـەك وتفاقیـان بـۆ هاوپـەیمانی خۆیـان نـارد وە عەمری کوری سالمی خوزاعی هاتە شاری مەدینـە وئـەم رووداوەی بـۆ پێغەمبـەری خـوا راگەیاند وە بەهۆنراوە ئەم دوژمنکاریەی هۆزی بەنی بەکرو قورەیشی تێدابوو باسی کرد وە پێغەمبەری خواش فـەرمووی: ئـەی عـەمری کـوری سـالم سـەرخرای وە لـەم کاتـەدا قورەیش زانیان کە هەڵەی گەورەیان ئەنجام داوە وە ئەبو سوفیانیان نارد بۆ مەدینە بۆ دانوستان لەگەل موسڵمانان وە بۆ درێژکردنەوەی ماوەی پەیمانی حودەیبیە وە وویستی لەگـەل پێغەمبـەر گفتوگۆ بکـات بـەڵام پێغەمبـەری خـوا رووی لـێ وەرگێـراو ناچـار بـە شەرمەزاری بەرەو مەککە گەڕایەوە وئامانجی نەپێکا وە لەم ماوەیەدا خەڵکی مەککە لـە چاوەنواری چارەنوسیان دابوون داخوا موسلمانان چیان بەسەر دێنن.

## ڕۆیشتن بەرەو مەککە:

پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی دا موسلمانان خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ وە ئەم هەواڵەی بەنهێنی هێشتەوە وە بەنهێنی بەهاوەڵانی گووت کە دەیەوێ بدا لە مەککە بێ ئاگاداری خەڵکی مەککە، ومەککە رزگار بکات بێ شەڕ وکوشتار بێ وە نزاو پارانەوەی ئەمەبوو کە خوایەگیان ئەم هەواڵی ئێمە نەگاتە قوڕەیشیەکان وخەڵکی مەککە هەتاکو لەناکاو بگاتە سەریان پێغەمبەری خوا نەی دەویست شەڕ لە مەککە روبدات بەڵکو بێ شەڕ خۆیان تەسلیم بکەن وە بەرێکەوت بەخۆی ودەهەزار سەرباز وە قورەیشیەکان بە هاتنی سوپایان نەدەزانی تاکو نزیك شاری مەککە بۆوە وە لەشەودا چەندەها ئاگریان داگیرساند وە ئاگری گەورە گەورەیان کردەوە وە ئەبو سوفیان وە هەندێك لەسەرکردەکانی قوڕەیش دەگەڕان بەنێوشاری مەککە بۆ وەرگرتنی هەواڵی موسلمانان وە کەچاویان بەم ژمارە زۆرەی ئاگر وچراکان کەوت نەیان دەزانی ئەمانە کێن وە لەسەرەتادا وایان دەزانی هۆزی خوزاعەیە، وە ئەبو سوفیان گەیشتە عەباسی مامی پێغەمبەر وتیێ گەیشت ئەمانە موسلمانن هاتوون بۆ ئازاد کردنی مەککە وشەڕ لەگەلیان مەحالە هیچ هێزێك ناتوانێ بەرگەی ئەمانە بگرێت وە هەردووکیان بە جوتە چونە لای پێغەمبەر وئەبو سوفیان خوا هیدایەتی داو موسولمان بوو وە موسلمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد گەڕایەوە بۆ ناو شارو ئاگاداری خەلکی کرد کەوا پێغەمبەر دەیەوێ بێتە نێو شاری مەککە ودەیەوێ بێ شەڕ ئازادی بکات.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی کەسێ بچێتەوە ماڵی خۆی ئەمین وپارێزراوە وە کەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان ئەوە ئەمین وپارێزراوە وەکەسێ بچێتە مزگەوتی حەرام ئەوە ئەمین وپارێزراوە.

چوونە ناو مەککە :

موسلمانان چوونە نێوشاری مەککە وەپێغەمبەری خواﷺ فەرمانی دا کەشەڕ نەکرێت تەنها لەگەڵ کەسانێك کەشەڕتان لەگەل دەکەن وە سوپاس بۆ خوا شەڕ رووی نەدا تەنها لەلای ئەو شوێنەی کە خالیدی کوڕی وەلید دابەزی بۆ نێو شاری مەککە لەوێ کۆمەلێك بەرەنگاری موسلمانان هاتن وکورتە شەرێك رووی داو وەلەئەنجامدا سێ کەس لەبێ باوەڕان کوژران، وە هەندێك کەس هەبوو لەمەککە زۆر ئازاری پێغەمبەریان دابوو پێغەمبەرﷺ بڕیاری دا لەهەرکوێیەك بن بیان کوژن وە هەندێکیان رایان کرد لەمەککە وە هەندێکیان موسڵمان بوون سەرووماڵیان ئەمین بوو وە تۆبەیان کرد پێغەمبەریش عەفوی کردن.

وە پێغەمبەری خوا هاتە نێو شاری مەککەوە بە شێوەیەکی مل کەچی بۆخوا لەبەر رێزو گەورەیی بۆ کەعبەی پیرۆز وە لەسەر پشتی ئێسترەکەی سەری نەوی کرد وسوپاسی خوای کرد بەرەو کەعبەی پیرۆز رۆیشت تەوافی کرد وفەرمانی دا بەلابردنی ئاسەواری بت پەرستی وەلەکاتی تەوافی مالی خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ٨١ ﴾الاسراء ٨١ واتە:( هەروەها بلێ تازە ئیتر حەق وراستی هاتووە بەرپابووە وتاڵ وناحەقی پووچوو تەواو نابووت بوو بەراستی ناحەق وبەتال هەرتیاچووە وجێگیر نەبوەو بەزیوە ) تەفسیری ئاسان ل٢٨٩ وە هەموو بتەکانی لابرد وکە لەدەوری کەعبەی پیرۆز بوو دوایی لەبەرامبەر خەلکیوەستا وفەرمووی (لا اله الا الله وحـده لاشـريك لـه صـدق وعـده ونصـر عبـده وهـزم الاحـزاب وحـده) وە قورەیشیەکانیش وەستابوون تەماشایان دەکرد وچاوەنواری ئەوە بوون کە داخوا چیان لێ دەکات پێغەمبەری خواش فەرمووی چیتان لێ بکەم ئەوانیش ووتیان تۆ برایەکی

بەرێز وکوری برای بەرێزی ئێمەی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بڕۆن ئەوا ئازادم کردن وە بەراستی ئازادکردنی مەککە قۆناغێکی گرنگ .

بوو لەمێژووی ئیسلام چونکە عەرەبەکان تەماشای قورەیشیەکانیان دەکرد کە ئەوان پارێزگاری مالی خوان بەلاّم کە قورەیش هاتنە ناو ئاینی ئیسلام بە کۆمەلّ هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ۝٣﴾ النصر١-٣

واتە: کاتێك یارمەتی وکۆمەکی خوا دێت شاری مەککە رزگار دەکرێت ودەرگای ئازادی والاّ دەکرێت(١) خەلکیشت بینی پۆلّ پۆلّ دەچنە ریزی ئاینی خواوە(٢) ئیتر تۆ سوپاس وستایشی پەروەردگارت بکە وداوای لێخۆشبوونی لیّ بکە چونکە بەراستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات وتەوبە وەرگرە(٣) تەفسیری ئاسان ل٦٠٣

ئەنصاریەکانی مەدینە پێغەمبەری خوایان زۆر خۆش دەویست حەزیان دەکرد پێغەمبەری خوا لای ئەوان بمێنیّ بەلاّم کە مەککە ئازاد کرا ترسی ئەوەیان بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەمەککە جێگیر بیّ نەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، بەلاّم پێغەمبەر ﷺ دلّی دانەوە وتێی گەیاندن کەوا ئەو بەنیاز نی یە لە مەککە جێگیر بیّ دەگەڕێتەوە بۆ مەدینەی منەوەرە لەگەلیان.

## هەڵسەنگاندن

١ هۆی چی بوو موسلمانان هەڵسان بەئازاردکردنی مەککە ؟

٢ بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد لەناکاو مەککە ئازاد بکات ؟

٣ هەر ڕستەیەك لەستونی أ بگەینە رستەی گەنجاو لەستونی ب.

(أ)

- لەو کاتەی ئەبو سوفیان سوپای ئیسلامی دیت .
- پێغەمبەر تەوافی کەعبەی کرد دەیفەرموو
- پێغەمبەر پاش ئازادکردنی مەککە بە قورەیشی ووت
- ئەنصاریەکان ترسان کە پێغەمبەر لە مەککە بمێنێ نەگەڕێتەوە بۆ مەدینە

(ب)

- دڵ ئەوایی دانەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە لەگەڵیان.
- چوو بۆلای پێغەمبەرو ئیسلامەتی ئاشکرا کرد.
- حەق هات وبەتاڵ پوچ بوو
- بڕۆن ئەوا ئازادم کردن

## وانەی بیست و سێیەم

# جەنگی حونەین وئابلۆقەی طائیف لە سالی ٨ی کۆچی



### ڕۆیشتن بەرەو مەککە

ئازادکردنی مەککە لەناکاو بوو بۆ خەلکی مەککە هۆزەکانی عەرەبی ناوچەکە وە خەلکانی هۆزی هەوازین وسەقیف و طائیف ترسان کە دەسەلاتی موسلمانان بگاتە ئەویش ئەوانیش بگرێتەوە بۆیە سوپایەکی بێ ژمارەیان کۆکردەوە بۆ ئەوەی بچن بەسەر مەککە دابدەن ولەناو بردنی موسلمانان لە مەککە وە سەرکردەی ئەم سوپایەش ناوی مالیکی کوری عەوف بوو وەلەگەل سوپاکەش دا ئافرەتان ومندالانیان لەگەل دابوون بۆ هاندان و وورە بەرزکردنەوەی سوپاکە وە بۆئەوەی بیر لە هەلاتن نەکەنەوە لە مەیدانی جەنگ.

### کەمین وخۆپەنهان دان لە حونەین:

کە موسلمانان ئاگاداری هاتنی سوپای هەوازین بوون ئەوانیش بەرەو رووی سوپاکە چوون بەرەو طائیف وە سوپای بێ باوەران لە شیوی حونەین بارەگەیان هەلدا وە لەناو کەند وشیوی حونەین خۆیان پەنهان دا لەو کاتەدا موسلمانان بەم ناوچەیە رەت بوون بت پەرستان پەلاماری موسلمانانیان دا هەردوو سوپاکە تێك گیران ولەم کاتە دا زۆربەی موسلمانان ژێرکەوتن بوو بە بەشیان تەنها کەمێکیان نەبێ لە چوار دەوری پێغەمبەر

ئەمانەوە وە ژمارەی موسلمانان لەم شەڕەدا دوانزە هەزار بوو لەوانە دەهەزاریان لەو موسلمانانەی کە بەشداری فەتحی مەککەیان کردبوو وە دوو هەزاریش لەو موسلمانانەی کە خەلکی مەککە بوون یەك لەو موسلمانانە ووتی ئەم ژمارە زۆرەی موسلمانان نابێت ژێر بکەوین وسەر دەکەوین بەڵام بەزۆری ژمارەی سوپا نیە بەلکو بە یەقین وبیرو باوەڕە وە قورئانی پیرۆز ئەم داستانەی بۆ تۆمار کردوین کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾التوبه ٢٠-٢٦

واتە: سوێند بێت بێگومان خوای گەورە لە زۆر شوێندا سەری خستن (بەسەر بێ باوەڕاندا) لەرۆژی حونەینیش کاتێك کە زۆری ژمارەی خۆتان سەرسامی کردبوون جا (بینیتان) ئەو زۆریە هیچ فریاتان نەکەوتو بێ نیازی نەکردن، زەویش چەندە فراوانە لێتان هاتەوە یەك وتەنگ بوەو، لەوەودوا هەموو پشتتان هەڵکرد وڕاتان کرد(٢٥) پاشان خوای گەورە ئارامی وئاسودەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی وموسلمانان وەسەربازانێکی دابەزاند کە نەتان دیوە، سزای ئەوانەیشیدا کە بێ باوەڕان بوون ئەوەش سزا وپاداشتی بێ باوەڕانە(٢٦) تەفسیری ئاسان ل ١٩٠ .

## دامەزراوی پێغەمبەر:

پێغەمبەری خواﷺ زۆر دامـەزراو بـوو وە پشـتی کـردە کێوەکـە وتەماشـای هـەردوولای خۆی کردو بانگی موسلمانانی خۆی کرد وفەرمووی ئـەی خەلکینـە وەرن بـۆلای مـن مـن پێغەمبەری خوام من موحەمەدی کوڕی عەبدوللام من پێغەمبـەرم درۆزن نـیم مـن کـوڕی عبدولموتەلیبم وە داوای لەمامی عەبباس کرد بەدەنگی بەرز بانگ بکـات بـۆ موسـلمانان ئەویش فەرمووی ئەی گەلی ئەنصـاریەکان ئـەی خـاوەنی پـەیمانی بـن دارەکـە (الشـجرة الرضوان) ئەوانیش ووتیان لە خزمەتت داین، لە خزمەتت داین، وە خەلکان کۆبونەوە لـە چواردەوری پێغەمبەر و لە دژی دوژمن شەڕیان کرد وبەشەڕێکی توند تا خۆرئاوابوون تا خوای گەورە سەرکەوتنی بۆ هێنان وە بەشێکی زۆری لەشکری هـەوازین بـە دیـل گـیران ومال وسامانیان بەتالان کەوتە دەست موسلمانان.

## ئابلۆقەی طائیف:

زۆربەی زۆری کافران تێك شکان وهەندێکیان هەلاتن بەرەو طـائیـف چـوون، وە سـوپای موسلمانان بەدوایان کەوتن بەرەو طائیف وەئابلۆقەی طائیفیـان دا ئـەوانیش خۆیـان لـە ناو قەلاکانیان قایم کرد وخۆیان بۆ ئابلۆقەی درێژخایەن ئامـادەکرد وە بـێ بـاوەڕان بـە مەنجـەنیق کەوتنـە بـەرد بـاران کردنـی سـوپای ئیسـلام لـەناو قـەلاکانیان بەهۆیـەوە ژمارەیەك لە موسلمانان شەهید وبریندازبوون وە پێغەمبەری خـوا وای بەچـاك زانـی کـە لەم ئابلۆقەیە بکشێتەوە بەرەو مەککە بگەڕێتەوە وەدەبێ رۆژێك بێت طـائیـف بکەوێتـە ژێر رکێفی ئیسلام.

وە سوپای ئیسلام گەرایەوە بۆ مەککە وسامانی جەنگی دابەش کرد بەسـەر موسـلمانان وە کەمێکی پێچوو هەتا وەفدێك لە هەوازین هاتنە لای پێغەمبەر وموسلمان بوون وبـەڵام هۆزی سەقیف مانەوە لەسەر بێ بڕوایی وە لـەپاش گەڕانـەوەی پێغەمبـەر لـە جـەنگی تەبووك ئەوانیش موسلمان بوون لە سالی نۆیەمی کۆچی دا.

## هەڵسەنگاندن

١. هۆزی هەوازین و سەقیف رایان چۆن بوو پاش فەتحی مەککە ؟

٢. مالیکی کوری عەوف چی کرد بۆ گەڕاندنەوەی سوپاکەی لە هەلاتن لەشەڕدا ؟

٣. ئەو هۆیان چی بوو کە پێغەمبەری خوا ئابلۆقەی طائیفی شکاند ؟

٤. نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ ـ موسلمانان فریو دران بەزۆری ژمارەیان لە جەنگی حونەین.

ب ـ لەسەرەتای جەنگی حونەین موسلمانان شکان بەهۆی نانەوەی کەمین لەشیوی حونەین لەلایەن کافرەکانەوە.

ج ـ پێغەمبەر دامەزراو بوو لەشەڕدا وبانگی موسلمانانی کرد بۆ گەڕانەوە بۆ مەیدانی جەنگ.

د ـ ژمارەی سوپای موسلمانان لە جەنگی حونەین دە هەزار کەس بوو.

هـ ـ موسلمانەکان ئابلۆقەی طائیفیان دا پاش جەنگی حونەین وە ئازادیان کرد.



## وانەی بیست و چوارەم

# جەنگی تەبوك لەسالی ۹ی کۆچی

### رۆمەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ گەیشت کە رۆمەکان خۆیان کۆکردۆتەوە لەشام وە لەگەل هاوپەیمانەکانیان لە هۆزەکانی عەرەب وەنیازیانە بۆ هاتن بەرەو دورگەی عەرەب بۆ شەرکردن دژی موسلمانان وە زال بوون بەسەریاندا. وە رۆمەکان چەندەها سیخورپیان هەیە لە دوورووەکان بەهۆی ئەو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی موسلمانان بەسەر کافرو بێ بروایان، پێغەمبەریش سوپای ئیسلامی رێکخست وبانگەوازی دا کە دەچن بەرەو تەبوك بۆ بەرگری لەهاتن لەسوپای رۆمەکان وە پیشەی پێغەمبەر ئەوەبوو بۆ هەر جەنگێك بچوبایە دیاری نەدەکرد بەڵام بۆ ئەم جەنگە ناوی هێنا وەتاکو موسلمانان خۆیان ئامادەکەن بەچەك وتفاقەوە.

### جەنگی نارەحەتی (العسرة):

کاتی ئەم جەنگە لەگەرمەی هاوین بوو کە ووشکە سالی بوو وە بۆیە ناونرا بە جەنگی نارەحەتی وسەخلەتی، وە پێغەمبەر ﷺ داوای لە دەولەمەندان کرد کە ماڵ وسامان ببەخشن بۆ کۆمەك کردنی ئەم جەنگە، بە کرینی چەك وتفاق وزەخیرەو ووشتر وئێستر، وە ئەوە بوو موسلمانان پێشبرکێیان دەکرد لەماڵ وسامان بەخشین وە هەرکەسێك بە

گوێرەی تاقەتی خۆی وە لەوانە عوسمانی کوڕی عەفان کە هەزار دیناری زێڕی بەخشی وە نۆسەد ووشتر وسەد ئەسپی بەخشی بۆ سوپا، وەپێغەمبەری خواش دوعای بۆ کرد وفەرمووی خوایە لە عوسمان رازی بە من لێی رازیم، وە عومەری کوڕی خەتاب نیوەی ماڵی خۆی هێنا وە ژمارەی سوپاکەش گەیشتە سی هەزار کەس.

**دەوری دووڕوودکان لەم جەنگەدا :**

دووڕووەکان هەڵسان بە بلاوکردنەوەی گومانی خراپ بردن لە دڵی موسلمانان وە کەوا ڕۆمەکان زۆرن، وە خۆیان پاشەکشەیان کرد وبروبەهانەی جۆراوجۆریان دەهێنایەوە بۆ خۆدەرباز کردن لەم شەڕەدا بۆ دوورکەوتنەوە ولەماڵەوە دابنیشن وە بەشداری نەکەن وە لەم کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ التوبە ٤٥ واتە: (بەڵکو بەراستی تەنها ئەوانە مۆڵەتت لێ دەخوازن کەباوەڕ بەخواو بەڕۆژی دوایی ناهێنن، ئەوانە هەمیشە دوودڵن ودڵە راوکێیانە بەردەوام لەگومانی خۆیاندا سەرگەردان ووێلن ودێن ودەڕۆن.) تەفسیری ئاسان ل١٩٤

وە شك وگومانیان دەخستە دڵی ئەو کەسانەی کە ماڵ دەبەخشن بۆ جیهاد لە موسلمانان وە ئەگەر موسلمانێك مال وسامانێکی زۆری هێنابا دەیان ووت ئەوە بۆ ریا وریابازیە، وە ئەگەر کەمی هێنابا دەیان ووت ئەم کەمە ماڵ وسامانە چ کەلکی هەیە وە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ

ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ التوبه ٧٩.

واتـه: ئـەو بـێ باوەڕانـەی کـە پـڵار دەگرنـە ئـەو ئیمانداارانـەی کـە زیـاد دەبەخشـن لـە خێرکردندا بە ویستی خۆیان لەڕێگەی خـودا، وپڵاریـش دەگرنـە ئیمانـدارانی هـەژار کـە بێجگە لەڕەنجی شـانی خۆیـان هیچی تریـان دەسـت ناکـەوێ ئینجـا هـەر گاڵتـەیان پـێ دەکـەن، ئەوانـە خـوا تۆڵـەیان لـێ دەسـێنێت وریسـوایان دەکـات، بـەهۆی ئـەو گاڵتـە کردنەیانەوە سزای بەئێش وئازار بەشیانە. (تەفسیری ئاسان ل١٩٩)

وە عەبدوللای کوڕی ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکان خۆی ئامـادە کـرد بـۆ جـەنگی تـەبوك لەگەڵ کۆمەڵێك لەدووڕووەکان، کەمێك مانەوە لەگەڵ بروادااران دوایی پاشەکشەیان کـرد وگەڕانەوە بۆ دابەزینی وورەی موسڵمانان.

ئەبو خەیسەمە:

ژمارەیەك لە هاوەڵان دواکەوتن لەم جەنگەدا لەبەر نەبوونی ئازوقەوئەسپ سواری وچەك وتفاقی شەڕ وەهەندێکیان لەبەر تەمبەڵی نەهاتن سوپای ئیسلام بەرێ کەوت وەلەوانەی دواکەوتن ئەبو خەیسەمەبوو وە لەرۆژێکی زۆر گەرم داهاتەوەماڵەوە وچووەنێوخێمەکەی وبینی دوو خێزانەکەی زەویەکەیان ئاوڕشێن کردوە وئاووی سارد وخواردنیان بـۆ دانـاوە وە لەم کاتەدا پێغەمبەری خـوای هاتـەوە یـاد کـە لـە چ نارەحەتیـەك دایـە لـەو گـەرماو تێنوێتیە وە مانـدووە، ووتـی سـوێندم بـەخوا نەدەچمە ژێـر خێمەکـە ونـە ئـاوو نانتـان دەخـۆم هـەتا دەگـەمـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە خێزانـەکانی خـۆی ووت دەی زووکـەن خێراکەن ووشترم بۆ ئامادە بکەن وزادو زەخیرەم بۆ حازر بکەن وەسواری ووشـترەکەی

بوو ڕۆیشت تا گەیشتە تبوك وە ئەم باس وخواسەی بۆ پێغەمبەری خوای گێرایەوە ئەویش دوعای خێری بۆ کرد.

## سوپا لە تەبوك :

سوپای ئیسلام پاش ماندوبونێکی زۆر ونەبوونی ئەسپ سواری وگەرمای هاوین گەیشتە تەبوك وە ووشتری تەواویان نەبوو هەربەدوو کەس بەنۆرە سواری ووشترێ دەبون وە پێغەمبەری خواﷺ نزیکەی بیست شەو لەوێ مایەوە وە لەمیانەی مانەوەی لە تەبوك پەیمانی لەگەل سەرداری (دەومەت ئەلجەندەل) وسەرداری ئیلە (العقبە) بەست وە بەلێنی لێوەرگرتن کە جیزیە وسەرانە بدەن بە موسلمانان وە دوابەدوای سەرکردەکانیان بوونە موسڵمان.

## گەڕانەوە بۆ مەدینە :

پێغەمبەری خوا پاش ئەوەی لە سنوری دورگەی عەرەب ئەمین بوو لە دەست درێژی رۆمەکان گەرایەوە شاری مەدینە وە بۆ رۆمەکان هێزو بازووی موسلمانانیان بۆ ڕۆن بۆوە دوا بەدوای وەفدی عەرەبەکان هاتن بۆ مەدینە پشتیووانی خۆیان بۆ ئیسلام دەربڕی وە موسلمان بوون وپەیمانی بەندایەتی بۆ خوایان دەربڕی وەخوای گەورە دووڕووەکانی ئابڕوبرد لەسورەتی تەوبەدا.

## هەڵسەنگاندن

1. بۆچی جەنگی تەبوك رووی دا ؟

2. هەلویستێك باس بکە لەهەلویستەکانی دووڕووەکان لەجەنگی تەبوك ؟

3. چەماوە بکێشە بەدەوری وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە.

أ ـ لەو کاتەی پێغەمبەری خوا بەرەو تەبوك بەڕێ کەوت

١ ـ بۆ چوونی خۆی ئاشکرا نەکرد

٢ ـ بە ئاشکرا باسی شوێنەکەی کرد کە رووی تێ دەکەن.

٣ ـ لەسەرەتادا شاردیەوە ولەدوایی دا ئاشکرای کرد

ب ـ لەو کاتەی ئەبو خەیسەمە هاتە مالەوە چاوی کەوت بەنازو نیعمەتی مالەوە؟

١ ـ سوێندی خوارد کە نەچێت بۆ مالەوە هەتا دەگات بە پێغەمبەرﷺ.

٢ ـ لەمەدینە ماوە ودواکەوت لە جیهاد.

٣ ـ مالی خۆی بەخشی لەتۆلەی نەچوون بۆ جیهاد.

ج ـ لەوکاتەی موسلمانان چوون بەرەو تەبوك

١ ـ چاویان بەڕۆمەکان کەوت وشەڕیان کرد.

٢ ـ سوپای ڕۆمەکانیان نەدیت وشەریان نەکرد.

٣ ـ ماوەیەك لەوێ مانەوە ودوایی چوون بەرەو شام بۆ شەڕکردن لەگەل ڕۆمەکان.



نیشانەی ڕاست (√) بەرامبەر ڕستەی ڕاست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ ـ پێغەمبەری خوا بۆچوونی خۆی شاردەوە لەچوونی بۆ تەبوك.

ب ـ ئەبو خەیسەمە دواکەوت لە جەنگی تەبوك.

ج ـ موسلمانەکان شەڕیان لەگەل ڕۆمەکان نەکرد لەجەنگی تەبوك

د ـ پێغەمبەری خوا پەیمانی لەگەل سەرۆکی ئەیلە وسەرۆکی دومەت ئەلجەندەل بەست.

## وانەی بیست و پێنجەم

# حەجی ماڵ ئاوایی ساڵی (١٠)ی کۆچی



لە نزیك بوونەوەی وەرزی حەج دا لەساڵی دەیەمی کۆچی دا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکرا رای گەیاند بۆ موسڵمانان کە دەیەوێ ونیازی هەیە حەجی ماڵی خوا بکات وە خەڵکێکی زۆر خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی هاوەڵی بن لەم سەفەرە پڕ خێرەدا وەپێغەمبەری خواش ﷺ رۆیشت بەرەو مەککە لە بیست وپێنجی مانگی ذی القعیدة لەپاش ئەوەی پۆشاکی ئیحرامیان پۆشی لە ذولحولەیفە) کە میقات وشوێنی ئیحرام پۆشینی خەڵکی مەدینەیە کە ئێستا پێ ی دەوترێت (أبیار علی) واتە بیری عەلی وە ئەم حەجەی پێغەمبەر تاکە حەجی بوو، وە بۆ ئەوەی خەڵکان لێ ی فێری واجیبات وئەرکانی حەج بن وە بانگەوازی ئیسلام سەرچاوەکانی ئیسلام بۆ خەڵکی باس بکات وە خەڵکانیش بە پەرۆشەوە بوون کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ حەج بکەن وە حەجی

ماڵی خوای ئەنجام داو لەسەر کێوی عەرەفە وەستا و ووتاری بەناوبانگی فەرموو کە هەموو ئاینی ئیسلامی تیادا باس کرد فەرمانی بە چەند شتێ کرد ونەهی لەچەند شتێ کرد وەئەمانەش چەند پارچەیەکن لەووتارەکەی بەڕێزی: ئەی خەڵکینە گوێ بگرن لە ووتەکانم چونکە نازانم پاش ئەم ساڵ لێرە لەم شوێنە پێتان دەگەمەوە یان نا ئەی خەڵکینە خوێنتان ماڵتان لەسەر ئێوە حەرام وقەدەغەیە تاکو دەگەنە بارەگای خوا، وە دەگەن بەخواو پرسیار لەکردەوەکانتان دەکرێ دەربارەی کردەوەکانتان وە کەسێ سپاردە وئەمانەتی لادانرا بابە ئەمینی ودەست پاکی بیداتەوە خاوەنەکەی خۆی وەهەموو ریبا وسودخۆری لەژێر پێم دایە وڕەت دەکەمەوەوە وە ئەو ماڵ وسامانەی داتان بەخەلك بەقەرز لێ یان بسەننەوە نە ستەم لەکەس بکەن وە نەستەمتان لێ بکرێ وە خوای گەورە ریبای حەرام کرد وە ئامۆژگاری موسلمانانی کرد دەربارەی ئافرەتان وەفەرمانی پێ کردن بە چاکە کردن لەگەڵیان، لەپاشان فەرمووی ژیربن ئەی خەلکی وەرگرن ئەگەر دەستی پێوە بگرن گومڕاو سەر لێشێواو نابن کە ئەویش پەراوی خوایە کەقورئانە وە خوورەوشتەکانی پێغەمبەرەکەیە.

ئەی موسلمانان بزانن هەمووتان برای یەکترن دروست نیە بۆ کەسێ ماڵی برای خۆی بسەنێ بێ رەزاو پێ دان نەبێت وە ستەم لەخۆتان مەکەن خوایە بەشاهێد بەمن پەیامەکەم گەیاند، وە موسلمانان ووتیان خوایە بەلێ گەیاندت وە پێغەمبەری خوا فەرمووی خوایە بەشاهید بە.

وە حەجی ماڵ ئاوایی پێش کۆچی دوای پێغەمبەر بوو بە چەند مانگێك وە ئاینی ئیسلام تەواو بوو بەتەواوی گەیاندی وە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿.... ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ....﴾(ئەمڕۆ ئاین

وبەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاند نازو نیعمەتم بۆ تەواو کردن وە رازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامە ودین وئاینتان) تەفسیری ئاسان ل١٠٧

ژمارەی موسلمانان لەم حەجەدا سەد هەزار بوو وەئەم ووتارە ووتاری مال ئاوایی بوو چونکە دواو کۆتایی بەیەك گەیشتنەوە بوو بۆیە ناونرا حەجی مال ئاوایی وە حەجی گەیاندن.

## هەڵسەنگاندن

1. پێغەمبەر چەند حەجی کردووە ؟
2. لە چ سالێك پێغەمبەر حەجی کردوە ؟
3. سێ شتی گرنگ روون بکەرەوە کە پێغەمبەر باسی کرد لە حەجی مال ئاوایی ؟
4. نیشانەی راست (√) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ - پێغەمبەری خوا چۆنیەتی حەج کردنی بە موسلمانان فێرکرد لە حەجی مال ئاوایی.

ب - پێغەمبەر پاش حەجی مال ئاوایی بە چەند مانگێك کۆچی کرد.

ج - ژمارەی موسلمانان لە حەجی مال ئاوایی سی هەزار کەس بوون.

د - پێغەمبەر دووسال پاش حەجی مال ئاوایی ژیا.

## وانەی بیست و شەشەم

# کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ سالی (١١)ی کۆچی

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە حەجی مالئاوایی تەواو بوو گەڕایەوە بۆ شاری مەدینەی منەوەرە، وە کاروباری موسلمانانی ڕێکخست تاکو کۆتایی مانگی سەفەری سالی یازدەی کۆچی، نەخۆش کەوت وە نەخۆشیەکەی زۆری بۆ هێنا بەلام لە هیچ نوێژێ دوانەکەوت لەگەلّ هاوەلانی لەمزگەوتدا تەنها لەو سێ ڕۆژی کۆتایی تەمەنی فەرمانی بە ئەبوبەکر کرد کە بەرنوێژ بەموسلمانان بکات، وە موسلمانەکان بڕوایان نەدەکرد بەم نزیکانە لێیان جودا بێتەوە بەیەك جاری کۆچ بکات کۆتایی بەژیانی هەتا هەتایی بێت بەلکو هیوای چاك بوونەوەیان بۆ دەخواست.

وە پێنج ڕۆژ پێش وەفاتی هاتە ناو موسلمانان لەمزگەوت و ووتاری بۆ دان ئاماژەی بە نزیك بوونەوەی مردنی کرد وەسیەتی موسلمانانی کرد بە چاك بوون دەربارەی ئەنصاریەکان وە زۆر نزاو پارانەوەی دەکرد لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی وە ئامۆژگاری بە خێرو چاکەی بۆ موسلمانان دەکرد لەوکاتەی نەخۆشیەکەی سەخت بوو گەیشتە گیانەلاو نەخۆشی گیان کێشان (سكرات الموت) ئەم دوعایانەی زۆر دەکرد دەیفەرموو (اللهم اغفرلي، وارحمني والحقني بالرفيق الاعلى، اسأل الله الرفيق الاعلى مع جبريل وميكائيل واسرافيل) واتە:(خوایە لێم خۆشبە وورەحمم پێ بکە وبمگەینە بە هاوەلّی بەرز، داوا لەخوا دەکەم بم گەینە (الرفيق الاعلى) لەگەل جوبرائیل ومیکائیل وئیسرافیل)

لەوكاتەی كە پێغەمبەری خوا، خۆشەویستمان تاجی سەرمان محمد المصطفی كۆچی دوایی كرد فاطیمەی كچی فەرمووی: ئەی باوكە گیان بەدەم فەرمانی خواوە چووی ئەی باوكە بەهەشتی خوا جێگاتە ئەی باوكە گیان پرسە وسەرەخۆشی لە جوبرائیل دەكەین.

وە دەنگ وباسی وەفاتی پێغەمبەرﷺ لە نێو موسلمانان بلاوبۆوە، شتێكی زۆر سادە نەبوو كە موسلمانان وەری گرن چونكە لەگەڵی راهاتبوون بەردەوام لەگەلی بوون لە ناوەوە ولەدەرەوە لەجیهاد وتێكۆشاندا وە دڵی ئەوانی پركردبوو لە خۆشەویستی وەرچەندە لە چەند ئایەتی قورئانیش ئامارە بەمردنی ئەو كراوە هەروەها لە فەرمودەكانی دا باسی كردوە كە لە ئایندە دا دەبێ سەفەری قیامەت بكەین، لە دونیای فانی دەربچین كە لەقورئاندا هاتووە كە دەفەرموێ:﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الزمر ٣٠.

واتە: (بەڕاستی تۆش دەمری وئەوانیش دەمرن وكەس نامێنێت) تەفسیری ئاسان ل٤٦١

وە هەروەها هاوەڵان لەبیریان چوو كە لەووتاری ماڵ ئاوایی فەرمووبووی گوێم لێ بگرن نازانم پاش ئەم ساڵساڵی تر پێتان دەگەمەوە یان نا لەم شوێنە، وە لەو كەسانەی مردنی پێغەمبەریان رەت كردەوە عومەری كوڕی خەتاب بوو كە لەبەرامبەر موسلمانان وەستابوو دەی فەرموو چەند پیاوێ لەدووڕووەكان وا گومان دەبەن كە پێغەمبەرﷺ وەفاتی كردوە، وە پێغەمبەری خوا وەفاتی نەكردوە بەلكو وەكو موسی پێغەمبەر(علیە الصلاة والسلام)چۆتە مناجاتی خواو دوایی دەگەڕێتەوە هەروەكو موسا پاش چل شەو گەڕایەوە لەپاشی ئەوەی كەووتیان مردووە سوێند بەخوا پێغەمبەری خواﷺ وەكو موسا پێغەمبەر دەگەڕێتەوە دەستی ئەو كەسانە دەبڕێت كە دەڵێن پێغەمبەری خوا وەفاتی كردوە.



وە ئەم هەواڵی عومەر گەیشتە ئەبوبەکری ڕاستگۆ ئەویش هاتە ناو مزگەوت بینی عومەر قسە لەگەڵ خەلکان دەکات دەربارەی وەفاتی پێغەمبەرﷺ ئەویش قسەی نەکرد وچووە ژوورەکەی کچی (عائیشە) خانی دایکی ئیمانداران ؓ وە بینی پارچە قوماشێك لەسەر دەم وچاوی پێغەمبەر دادرابوو ئەویش پارچە قوماشەکەی هەلگرت ونیوچاوانی پێغەمبەری ماچ کرد وفەرمووی دایکم وباوکم بەقوربانت بێ، وە پارچە قوماشەکەی لەسەر دەم وچاوی دانا وهاتە دەرەوە وهەولی دا عومەر بێ دەنگ بکات بەلام عومەر بێ دەنگ نەبوو لەپاشان هەلساوە سەر پێ و ووتاری داو لە پاش سوپاس وستایشی خوای کرد فەرمووی: ئەی خەلکینە کەسێ موحەمەدی دەپەرست ئەوا موحەمەد کۆچی کرد وە کەسێ خوای گەورە دەپەرستێ ئەوا خوا زیندووە ونامرێ لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کەخوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾آل العمران ١٤٤.

واتە: ﴿موحەمەدﷺ تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەویش (وەفاتیان کردوە) ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو ئێوە پاشگەز دەبنەوە وهەڵدەگەڕێنەوە؟! لەو دین وئاینەی کە پێی ڕاگەیاندوون) خۆ ئەوەی هەلگەڕێتەوە وپاشگەز بێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێ لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.﴾تەفسیری ئاسان ل٦٨

وە ئەبوبەکر بە خوێندنی ئەم ئایەتە گومانی لەدڵی موسلمانان لابرد کە لە وەفاتی پێغەمبەر پەیدابوو وەخەلکان وەکو تازە ئەم ئایەتە هاتبێتە خوارەوە وایان زانی، دوای یەقینیان کرد کەوا ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوای کردوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەرۆژی دووشەم دوازدەی مانگی رەبیعی یەکەم لە تەمەنی شەست وسێ ساڵی کۆچی دوایی کرد ولەرۆژی دواتر لەژوورەکەی عائیشەخان ئەسپەردەی خاك کرا وە عەبباس وعەلی کوری ئەبو تالیب شۆردیان لاشەی پیرۆزی وکفنیان کرد وە کۆمەڵ کۆمەڵ موسلمانان نوێژیان لەسەری کرد وە موسلمانان پرسەو تەعزیەی وسەرەخۆشی یەکتریان دەکرد بە بۆنەی کۆچی دوایی سەروەری مرۆڤایەتی موحەمەدی موستەفاﷺ وە گەورەترین موسیبەت بوو رووی لە موسلمانان کرد کۆستی گەورەیان کەوت.

یاخوا خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ئەی موحەمەد ئەی چاکترین دروست کراوی خوا ﷺ.

## هەڵسەنگاندن

١ کەی پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد ؟

٢ چەند رۆژێك بوو پێغەمبەر دابرِا لە موسلمانان لە نوێژ پێش کۆچ کردنی ؟

٣ باسی ئەو نزایە بکە کەپێغەمبەری خوا دەیکرد پێش کۆچی دوایی ؟

٤ چەماوە بکێشە بە وەلامی راست لەمانەی خوارەوە.

أ ـ لەو کاتەی عومەر گوێی لەهەوالی مردنی پێغەمبەر بوو

١ - وەفاتی پێغەمبەری ڕەتکردەوە وخەلکی ترساند بەوەی ئەم هەواڵە بڵاوبۆتەوە.

٢ - تێك چوو شلەژا وخەفەتی خوارد بۆ پێغەمبەر.

٣ - چووە لای کچی حەفصە ولەڕاستی ئەو هەواڵەی کۆلیەوە.

ب - لەو کاتەی هەواڵی مردنی پێغەمبەر گەیشتە ئەبوبەکری ڕاستگۆ

١ - بڕوای نەکرد بە وەفاتی پێغەمبەر.

٢ - هاتە ژووری عائیشەخان وبۆ ڕاستی دەنگ وباسەکە.

٣ - کۆبونەوەی لەگەل عومەر کرد بۆ زانینی هەواڵی ڕاست.

ج - لەوکاتەی خەڵکان گوێیان لە ووتاری ئەبوبەکر بوو

١ - دڵنیابوو لە ڕاستی وەفاتی پێغەمبەر.

٢ - گەڕانەوە بۆ قورئان وبۆ تێگەیشتنی هەواڵەکە لە قورئان دا.

٣ - گلەیی وگازندەیان لەعومەری کوری خەتاب کرد لەبەرئەوەی ڕەتی دەکردەوە هەواڵی کۆچی پێغەمبەر.

٥ نیشانەی ڕاست (√) بەرامبەر ڕستەی ڕاست وەنیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

أ - ئەبوبەکر پێشنوێژی بەموسلمانان کرد بۆ نوێژی مردوو لەسەر پێغەمبەر.

ب - عەبباس وعەلی کوری ئەبو تالیب لاشەی پێغەمبەریان شۆرد.

ج - پێغەمبەری خوا ﷺ لە گۆرستانی بەقیع نێژرا.

د- پێغەمبەری خوا لەژوورەکەی عائیشە رضي الله عنها نێژرا.

## وانەی بیست و حەوتەم

# خووڕەوشتی قورئان بوو



پرسیار لە عائیشـــــە خان رضي الله عنها کرا دەربارەی خوو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی خووڕەوشتی دەقاو دەق قورئان بوو وە قورئانی پـــــیرۆز باسی خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ موسلـــمانان دەکـات دەفــەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾القلـم ٤ (بەڕاسـتی تـۆ لەسـەر خووڕەوشتی گەورەی) وە هەروەکو ئەنەسی کوڕی مالیك وەسفی دەکات وکەجوانترین وچاکترین کەس بوو لە رەوشت بەرزی. ئەنەسی کوڕی مالیك زیاد لە دە سالان خزمـەتی پێغەمبەری خوای کردووە وەلەسـەرتادا منـال بـووە لـەلای ئـەو گـەورە بـووە بـەردەوام لەخزمەتی دابوو خۆی وەسفی دەکات کـە خوڕەوشـتی جـوان بـوو نـەرم ونیـان بـوو لـە هەلسوکەوت دا ئەنەس دەفەرمووێ: خزمـەتی پێغەمبـەری خـوام کـرد دەسـاڵان جارێك پێی نەووتم بۆ ئەم شتەت کـرد یـان بـۆ ئەمـەت نـەکردووە وە رۆژێك بـۆ کارێك ناردی بەدوای دا ئەنەس دەفەرموێ: منیش بە هەڵسوکەوتی مناڵان وەلامم دایەوە ووتم سـوێند بەخوا ناچم بەلاّم بەزمان بوو بەدڵەوە نەبوو، داوای پێغەمبـەری جـێ بـەجێ کـرد ودوای چوو کارەکەی کرد ئەنەس رۆیشت چاوی بەکۆمەڵێ مناڵ کەوت گاڵتەیان دەکرد ئـەویش لەگەڵیان وەستا ولـەم کاتـەدا پێغەمبـەری خـوا بـەدوای داچـوو دەسـتی گـرت وئەنـەس

تەماشای پێغەمبەری کردو کەپێ دەکەنێ فەرمووی: ئەی ئەنەسۆکە برۆ بۆ ئەو کارەی فەرمانم پێ کردی ئەویش فەرمووی دەچم ئەی نێردراوی خوا. بەڕاستی پێغەمبەر نەرم ونیان بوو لەگەل ئەنەس، لێی نەداوە ولێی توڕە نەبوە وەدەری نەکردوە بەڵکو بەزمانی شیرین قسەی لەگەل کردوە.

وە لەخووڕەوشتی پێغەمبەر ئەوەبوو چاودێری تەبیعەت وڕەوشتی خەلکی دەکرد، ڕقی هەڵنەدەستا لەو کەسەی کە ئازاری دەداو، جارێ عارەبێکی دەشتەکی هاتەلای ئەویش لەگەل هاوەڵانی دەڕۆیشت بەرماڵێکی بەسەر شانی بوو بەتوندی رای کێشا شوێنی راکێشانەکەی لەشانی پێغەمبەر گیر بوو ئازاری زۆری پێ گەیشت ووتی ئەی موحەمەد لەو ماڵەی خودا پێی داوی بمدەرێ، ئەویش تەماشای عارەبەکەی کردو پێ کەنی وفەرمانی کرد ماڵ وسامانی پێ بدەن وە لەم ڕووداوە دیار کەوت کە چەندە ڕەوشت بەرزبوە بۆیە خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ .... ﴾آل عمران ١٥٩.

واتە: (کەوابوو ئەی موحەمەد بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم ونیان بووی لەگەلیاندا خۆ ئەگەر توڕە وقسە ڕەق وبێ بەزەیی بای ئەوە هەموو لەدەورت بلاوەیان دەکرد کەواتە چاوپۆشیان لێ بکە.) تەفسیری ئاسان ل٧١

وە خوڕەوشتی نەرم ونیان بوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ ماڵ ومنداڵی ڕێك وپێك بووە وە دەیفەرموو بەموسڵمانان (خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأهْلِهِ وأَنَا خَيْرُكم لأهْلِي) رواه الترمذي واتە: چاکترینتان چاکترین کەسێ بۆ خێزانەکەی ومنالەکەی ومن چاکترین کەسم بۆ ماڵ ومنالّم. وەعائیشە بەکورتی باسی دەکات دەفەرموێ نەرم ونیان ترین بوو وەبەرێزتر بوو

لەهەموو کەس وە گاڵتەی لەگەڵ حەسەن وحوسەین دەکرد لەو کاتەی منال بوون وماچی دەکردن وە ئەگەر پێغەمبەریان بدیبایە لە کڕنوشە دەچونە سەر پشتی ئەویش کرنوشی درێژ دەکردەوە تاکو ئەزیەتیان نەبێ لەسەر پشتی خۆی.

وە خەلکی خۆش دەویست وەهەواڵی خەلکی دەپرسی وحەزی دەکرد سەردانیان بکات وە داواکاری جێ بەجێ بکات وە داوای لەهاوەلان دەکات کە چی پێویستیان هەیە پێی رابگەیەنن تاخۆی بۆیان جێ بەجێ بکات.

وە قورئانی پیرۆز باسی خوڕەوشتی دەکات بەووشەی کورت وپڕ مانا گەورەیی رەوشت بەرزی باس دەکات کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾القلم ٤ واتە: بەراستی لەسەر رەوشتی بەرزی.

## هەڵسەنگاندن

1. عائیشە خان بە چی باسی خوڕەوشتی پێغەمبەری کرد ؟
2. چۆن پێغەمبەر هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەنەسی کوری مالیك کرد لەکاتی خزمەت کردنی ؟
3. باسی چیرۆکی پێغەمبەرﷺلەگەل عارەبەکەی دەشتەکی بکە ؟
4. هەلسوکەوتی پێغەمبەر چۆن بوو لەگەل حەسەن وحوسەین (رضی الله عنهم)؟

## وانەی بیست و هەشتەم

### بێ فیزی وخۆ بەکەم زانینی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەری خوا گەورەی کوڕانی ئادەمە، خۆی کۆتا هاتنی پێغەمبەرایەتی یە وە خاوەنی شوێنی سوپاس کراوە (المقام المحمود) لە رۆژی قیامەت لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بێ فیز بوو خۆی بە زل نەدەزانی بەسەر خەلکی دا.

وە لەبێ فیزی پێغەمبەر، پێغەمبەر ﷺ حەزی نەدەکرد کەس ئەوەندە بەرزی بکەنەوە لە مەدح دا تا بیگەیەنە پلەی پەرستنی خوا وە پیاوێ هاتە لای ویستی خۆشەویستی پیشانی پێغەمبەر بدات ووتی ئەی گەورەمان کوڕی گەورەمان وئەی چاکترینمان وکوڕی چاکترینمان، وە پێغەمبەر ﷺ ویستی فێری وانەیەکی وای بکات وە نەهی کرد لەو پیاوە لەو قسانەی کە کردی هەتاوەکو نەبێتە هۆی کرانەوەی دەرگانی شەیتان لەسەر موسلمانان بەوەی باسی شتێ بکەن کە لایقی ئەو نەبێت وە ئامۆژگاری کردن بۆ چاکترین سیفەت کە حەزی دەکرد باسی پێ بکەن ئەویش فەرمووی: من موحەمەدی کووڕی عەبدوللام، وە پێغەمبەری خوام وە سوێندم بەخوا حەزناکەم زیاترم بەرزبکەنەوە کە خوا بەرزی کردومەتەوە.

وە لەبێ فیزی پێغەمبەر ئەوەبوو حەزی نەدەکرد خۆی لەهاوەلان بەرێزتر بگرێ وجیابێتەوە لەوان لە جل وبەرگدا وە ئەوانیش زۆریان خۆش دەویست لەگەڵ ئەو هەموو عیلم وزانیاریەش کە هەی بوو وە ئەوەبوو جارێکیان دۆلکەیەك یان پەرداخێك ئاویان هێنا پێشی ئەو خواردیانەوە دوای ووتیان با بەرداخێکی تر بۆتۆ بێنین ئەوویش رازی نەبوو فەرمووی بەو بەرداخەی خەلکی پێی دەخواتەوە منیش دەخۆمەوە، وە ئەگەر

بچوبایە شوێنی دانیشتن ئەوا پێی خۆش نەبوو کەس لەبەری هەڵسێ ولەجێگای خەلکی دانەدەنیشت بەلکو لەکوێ چۆڵ بوایە لەوێ دادەنیشت وە ئەوەی هاتبایەلای کە نەی ناسیبا نەی دەزانی کامیان موحەمەدە.

وە پیاو هەبوو کە دەهاتە لای پێغەمبەر لەبەر سام وهەیبەتی پێغەمبەر دەستی بەلەرزین دەکرد ولەترسان ئەویش پێی دەفەرموو مەترسە من وەکو مەلیك وپاشا نیم من کوڕی ئافرەتێکم لە قورەیش کە گۆشتی ووشك کراوەی بەرخۆری دەخوارد.

وە بێ فیز بوو لەگەڵ خەلکان وە لەگەڵ ماڵ ومنالی کەوا عائیشەخان بۆمان دەگێڕێتەوە کە لەوکاتەی پسیاری لێ کرا دەربارەی حالی پێغەمبەر لەمالەوە، وەچی دەکرد لەمالەوە وەلامی ئەمە بوو ئەو بەشەر بوو وەکو خەڵکی، ئێوە چی دەکەن ئەویش وای دەکرد لەمالەوە پێلاوەکانی بەخۆی چاك دەکردەوە درووماني وپینەی کراسی بەدەستی خۆی دەکرد ومەڕی دەدۆشی وخزمەتی خۆی دەکرد، بێ فیزی پێغەمبەر نمونەیەك بوو بۆ خەلکان بووە هۆی خۆشەویستی خەلکان بۆی.

## هەڵسەنگاندن

١. هەلویستی پێغەمبەر چی بوو لەوکاتەی کەسێ پێی ووت تۆ گەورەمانی کوڕی گەورەمانی ؟

٢. نمونەیەك لە نمونەکانی بێ فیزی پێغەمبەر ﷺ باس بکە ؟

٣. ئەم بۆشایانە پربکەوە ؟

أ ـ پێغەمبەر فەرمووی بە هاوەلانی ئاوم بدەنێ بەوەی خەلکان پێی دەخۆنەوە.......

ب ـ پێغەمبەر بەو کەسەی ووت کە لێی ترسا من وەکو ........ نیم.

ج ـ پێغەمبەر لەماڵەوە دوورومان ......و مەڕی ..........

## وانەی بیست و نۆیەم

## بەخشندەیی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترین کەس بوو وە هاوەڵان باسی بەخشندە ودڵ فراوانی ئەویان دەکرد وەکو بای هەڵکردوو پێش باران وا بوو وە بەتایبەتی لەمانگی ڕەمەزان زۆر سەخی بووە لەو کاتەی جوبرائیل دەهاتە لای وقورئانی پێ دەورو دوبارە دەکردەوە، وە لەنمونەی سەخی وبەخشندەیی پێغەمبەر ﷺ ئەمەبوو کە پیاوێ کراسێکی گران بەهای بەخشی بە پێغەمبەر ولەبەری کرد وە هاتەدەرەوە کە هاوەڵان بینیان یەکێك ووتی ئەم کراسەم پێ بدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش گەڕایەوە ماڵەوە کراسەکەی لەبەر کردەوە دای بەکابرا وە هاوەڵانی سەرزەنشتی کابرایان کرد وئەویش فەرمووی بۆ ئەمەم بوو کە لەپاش مردنم بیکەن بەکفنم بۆم وە عادەتی وابوو ماڵی دەبەخشی بەو کەسانەی تازە موسلمان بوون کە خوا ناوی ناون بە (المؤلفة قلوبهم) بۆ دڵ قایم بونیان وە تابزانن ئیسلام دەرگای خێرە بۆ دین ودونیا وە ئەنەس باسی ئەو کەسانەی دەکرد کە دەیفەرموو پیاو هەبوو کە دەهاتە لای پێغەمبەر وموسلمان دەبوو بۆ ئەوەی دەوڵەمەند بێ وەکە پێغەمبەری خوا ماڵ وسامانی پێ دەبەخشی وەکە ئێوارە دەهات ئەو پیاوە دین وئاینی لەلا لەهەموو شتێ خۆشەویستر دەبوو.

وە پیاوێ ڕۆژێ هاتەلای وداوای شتی لێ کرد ئەویش مێگەلە مەڕێکی داپێی کە لەنێوان دوو کێوابوون وەدوای موسلمان بوو وە زانی کە پێغەمبەری خوا سەخی وماڵ بەخشەرە

وە گەڕایەوە بۆلای گەڵەکەی وپێی فەرموون وەرن با موسلمان بین سوێندم بەخوا موحەمەد دەبەخشێ ولەهەژاری ناترسێ.

وە صەفوانی کوڕی ئومەیە باسی سەخی ودڵ فراوانی پێغەمبەر ﷺ دەکات دەربارەی موسلمان بوونی خۆی کە صەفوان خۆی لە جەنگی حونەین بەشداری کردبوو وە ئیمان وبڕوای لەدڵی جێگیر نەبوو بەتەواوی، هاتە لای پێغەمبەر ودەسکەوتی (جەنگی حوونەین) مالی پێ بەخشی لەوە صەفوان باسی دڵ قایم بوونی خۆی دەکات ودەفەرموێ ئەوەندە سامانی پێ بەخشیم تا کەلەپێشدا زۆر ڕقم لێ دەبویەوە وە ئەوسا ئاوام لێ هات کە خۆشەویسترین کەس بوو لەلام.

پێغەمبەری خوا بەخشندە بوو وە داوای دەکرد موسلمانانیش بەخشندەبن وە کەدەفەرموێ: (خوای گەورە دوو فریشتەی ناردوە بۆ هەریەکێك لە ئێوە هەموو بەیانیەك دوعا ونزا بۆتان دەکەن دەڵێت"خوایە ئەوەی ماڵ دەبەخشێ بۆی زیاد بکەی وتۆڵەی بۆ بکەیتەوە وە ئەوەی نایبەخشێ مالی لێ تەفرو تونا بکەی").

## هەڵسەنگاندن

١ بۆچی هاوەڵەکەی پێغەمبەر داوای لەکراسی پێغەمبەر کرد کە پێی ببەخشێ ؟

٢ هەلوێستی صەفوانی کوڕی ئومەیە باس بکە لە بەخشندەیی پێغەمبەر ؟

٣ هەر ڕستەیەك لەستونی أ بگەینە رستەی گەنجاو لەستونی ب

| ستوونی - أ - | ستوونی - ب - |
| --- | --- |
| -لەبەخشندەی پێغەمبەر | -دای بەوهاوەڵە |
| -پێغەمبەر سەخی ترین کەسبوو لە | -دەی بەخشی لەهەژاری نەدەترسا |
| -هاوەڵەك داوای لەپێغەمبەر کرد کە کراسی خۆی پێ ببەخشێ | -ڕەمەزان لەو کاتەی جوبرائیل دەوری قورئانی پێ دەکردەوە |

## وانەی سییەم

# ئازایەتی پێغەمبەر

ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە گشتی ئازایەتی وجیهاد وتێ کۆشان بوو وە ژمارەی جەنگەکانی کە بەشدار بوو لەو تەمەنەی کە لەمەدینە بەڕێی کرد گەیشتە بیست وحەوت جەنگ وغەزا، وەهاوەڵان باسی ئازایەتی ئەو دەکەن وە دەڵێن کە بەئازاترو چاو نەترس بوو بەردەوام لە ڕیزی پێشەوەی سوپا دابوو لە جەنگدا وە نزیکتر بوو لە دوژمن لە ئێمە وە هاوەڵان دەفەرمون ئەگەر شەڕ گەرم بوایە خۆیان بەو دەپاراست وە ئازایەتی ئەوە بوو کە دامەزراوبوو لەجەنگدا وە هەڵاتن بەشی ئەو نەبوو، وە لەو کاتەی موسلمانان لەجەنگی ئوحود شکستیان هێنا پاش ئەوەی لەسەرەتادا سەرکەوتن پێغەمبەری خوا بە خۆیی وچەند کەسێك نەبێ ئەوانی تر هەڵاتن وە لەم کاتەدا دوژمنانی ئیسلام لەچواردەوری پێغەمبەر کۆبونەوە دەیان ویست پەلاماری بدەن لە ئوحود وبیکوژن هەتا بەردبارانیان کرد کەوت بەزەویدا وددانی پیرۆزی شەهید بوو وە نێوچەوانی خوێنی لێ دەتکا وە هاوەڵانیش خۆیان دەدا بەسەر ئەو تیرانەی کە بۆی دەهاتن وە لەم کاتەدا کە بت پەرستان لێی دوورکەوتنەوە ئەویش چووە سەر کێوەکە وئوبەی کوڕی خەلەف دوژمنی سەر سەختی ئیسلام هاواری کرد من رزگار نەبم ئەگەر موحەمەد رزگاری بێ، پێغەمبەری خوا لەوکاتەی هاوەڵان ویستان پەلاماری بدەن فەرمووی: بۆ منی لێ بگەڕێن وە لەگەڵ ئەوەی خۆی بریندار بوو بەڵام پەلاماری ئوبەی داو لەسەر ئەسپی بەری دایەوە وبەشیرەکەی خۆی لەسنگی داو کوشتی.

وه هەروەها لەجەنگی حونەین دا موسلمانانەکان لەناکاو تووشی کەمینی دوژمن بوون ولەشیوی حونەین وە پاشەکشەیان کرد وهەلاتن وە لەسەرەتادا ژێر کەوتن بەلام ئەو دامەزراوبوو لەگەڵ کۆمەلێ لە هاوەلان شەڕیان دەکرد تا ئەوە بوو بانگی هاوەلانی دەکرد وبەگەرانەوە بۆ مەیدانی جەنگ وە دەیفەرموو: من پێغەمبەری خوام من پێغەمبەری خوام درۆ ناکەم من کوڕی عەبدولموتەلیبم وە نەترسا لەوەی بت پەرستان گوێیان لێبێت وە هەر بوە هۆی گەڕانەوەی موسلمانان دامەزراوی وئازایەتی خۆی بوو لەجەنگی حونەین تا بەسەرکەوتن کۆتایی هات.

وە لەئازایەتی ئەو کە لەهەوال و حالی موسلمانانی دەکۆلیەوە لەشاری مەدینە وەپەلەی بوو بۆ چوونی بۆ شوێنی ترسناك. تا ئەو شەوەی موسلمانان لەمەدینە شەوێك گوێیان لە دەنگێك بوو شلەژان وبەدوای دەنگەکەدا چوون وە کە گەیشتنە ئەوێ دیتیان پێغەمبەر پێش ئەوان لەوێ بوو دەگەڕایەوە دەیفەرموو ئەوە دوژمن نەبوو هیچ نەبوو دڵ نەوای کردن وگەڕانەوە نیو شاری مەدینە.

## هەڵسەنگاندن

١. یەك هەڵوێستی ئازایەتی پێغەمبەر باس بکە لەجەنگی ئوحود ؟

٢. نمونەیەك لەئازایەتی پێغەمبەر باس بکە لە جەنگی حونەین ؟

٣. ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە ؟

أ ـ ژیانی پێغەمبەر لە مەدینەی منەوەرە........بەردەوام بوو.

ب ـ ژمارەی جەنگەکانی پێغەمبەر.......جەنگ بوو.

ج ـ ئەگەر هاوەڵان شەڕ زۆری بۆ هێنابان خۆیان دەپاراست بە........

د ـ پێغەمبەر پەلاماری........دا وشیرێکی لە سنگی داو لەئەسپی بەری دایەوە.

# چەمکە شیعرێک

## لەخزمەت رابەری ژین ﷺ

نووسینی

**محمد حمد خەتیبی**

١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز

## نوری سەروەر

کەنوری زینەتت هاتە دونیا سەروەر

خاکی ژێر پێت بوو بەکانی دوڕ و گەوهەر

شیرنی مژدانەی بوونت ئازادی بوو

باوی نەما جەورو ستەمی ڕۆم و قەیسەر

دەرت هێنایین لەمەینەتی کۆیلایەتی

لەدیلی زیندانی نەفس و نەهامەتی

هەر تۆی شایستەی لێزمە بارانی درووود

گیانە تۆی ئافەریدەی پێشەوایەتی

لەپڕ هەوری ئازادی سەری خۆی هەلگرت

دەست بەجێ شەپۆلی عەدالەت ئۆقرەی گرت

زەوی رەوشەن کرد هەلاّت خۆری بەختیاری

لەسایەی تۆ مرۆڤایەتی ئۆخەی کرد

هەڵت کرد گەردەلوولی دژ بەنەفامی

هەڵت پێچا دەواری ڕەشی نەزانی

لەخوێندنگای حیرا وانەی (إقرأ)ت خوێند

هـــەر لـــەوێ شـــا بڕوانامـــەت بەدەســـت هـــانی

ئـــەو ڕۆژەی لەگەشـــتی خـــەڵوەت گەڕایـــەوە

هەگبـــەی ســـەفەرت كۆڵـــێ بـــوو لەژیانـــەوە

پـــڕ ملوانكـــەی هیـــوای ژینـــی كچـــۆڵان بـــوو

بـــۆ باوكـــان پـــڕ بـــوو لەســـۆزی نەبڕایـــەوە

بەیـــداغێ بـــوو لـــەدەوری كەعبـــە هەڵـــدرا

گابـــان و ســـوهەیب و ســـەلمانی كـــردە بـــرا

بـــیلال بـــوو ماشـــی (احـــد)ی بـــۆ خوێنـــدەوە

جـــاڕی سەربەســـتی كۆیلـــە و چەوســـاواندرا

٢

## خاكی مەدینە

خـــاكی مەدینـــەم بۆیـــە خـــۆش دەوێ

ئـــەو دڵـــەم تـــەنها لـــەوێ ئەســـرەوێ

چـــونكە ئەحمـــەدی گرتۆتـــە بـــاوەش

هـــەر لـــەوێش چـــاندی نـــەمامی بـــاوەڕ

ئـــەی شـــاری شـــەبەق شـــاری مەدینـــە

ووزەی هـــــەناوم فێنكـــــی ســـــینە

گەڕیـــدەی عەشـــم بـــۆ لات ڕێ ئەكـــەم

هـــەروەك شـــەماڵم بـــۆ لات هـــەڵ ئەكـــەم

ســـــڵاو لـــــەكانی ســـــازگاری بـــــەدر

چـــۆن باوەشـــی دا لەشـــەوی قـــەدر

دار خورماكانـــــــت كەئەشـــــــنێنەوە

(طلـــــع البـــــدر)ت بـــــۆ ئەڵێنـــــەوە

ئـــــەی شاســـــوارەكەی كـــــاروانی هـــــودا

بـــۆ ئێمـــەت هێنـــا پـــەیامی خـــودا

هـــەر تـــۆی ئەســـتێرەی گەشـــی نبـــوّە

درەختی دایم سەوزی أخوە

بەهاتنی تۆ نەختی ستەم لەق بوو

بەئیشارەت مانگ لەئاسمان شەق بوو

زوبان بەجارێ لەمەدحت لاڵە

ووشە لەئاستت خەجاڵەت بارە

ئەی من چۆن بکەم مەدحی تۆی سەروەر

گەر بەسوورەتی قەڵەم و کەوسەر

( ٣ )

## ئەی پێغەمبەر

ئـــەی پێغەمبـــەری خووڕەوشـــت بـــەرز

ئـــەی چـاکترین کـەس لەســەر ڕووی ئــەرز

تــۆی هــەورە تریشــقەی بـارانی ڕەحمــەت

تـــۆ ڕەواندتـــەوە ئەســـتەم و زەحمـــەت

بیابـــانی وشـــکت کـــرد بەگوڵســـتان

بەوێنـــەی بـــەهار ڕات مـــاڵی زســـتان

دونیـات ڕۆنـاک کـرد بـووی بەشـەمع و چـرا

لەسـایەی تـۆوە بـووین بەخوشـك و بـرا

بـــۆ هـــەموو جیهـــان ڕەحمـــەتت هـــانی

بـــــەدیاریت هێنـــــا داد و یەکســـــانی

هــەروەکو خــۆر بـووی دات لەگشــت جێگـا

بەئێمـــــەت ناســـــاند چـــاکترین ڕێگـــا

تـــۆ بـــۆ ئوممـــەتت خـــۆت ئەتوانـــدەوە

چـــــرای ئازادیـــــت داگیرســـــاندەوە

بـــەڵێن بـــێ لەســـەر ڕێبـــازت بـــژین

گیانمـــان ببەخشـــین لـــەڕێگات بمـــرین

( ٤ )

## چرای ڕێگەمە ڕابەری ژینم

گوڵاڵــــە ســـوورەی بـــەهاری ئەشـــق

لووتکــەی بــەرزی ڕەوشـتی سەرمەشـقت

درووود و ســــــڵاو لەدیــــــداری تـــــۆ

جــۆش و خرۆشــم بــۆ روخســاری تــۆ

چـــــرای ڕێگەمــــــە ڕابــــەری ژیـــــنم

ئەوپــــەڕی بــاوەڕ فرمێســـك و گریـــان

دونیـــا نەویســـتن بەســـادە ژیـــان

گوفتـــــاری دەوای دەردی دڵانـــــــت

بـــۆ یـــار و نـــەیار خەنـــدەی لێوانــت

چـــــرای ڕێگەمــــــە ڕابــــەری ژیـــــنم

چــی فــەرمان بــدەی هــەمووی لەجێیــە

زمانـــــت نــــاخزێ سروشـــــت پێیــــــە

هەرچــی فەرمووتــە لــەوورد لــە درشــت

ســافی گەوهــەرە لەخــەرمان لەمشــت

چـــــرای ڕێگەمــــــە ڕابــــەری ژیـــــنم

لێبوردەیـــت بـــۆ یـــار و نایـــاران

بەخشــــــندەیت بـــــۆ دارا و نـــــەداران

لەگــــەڵ هاوڕێیانـــــت چـــاکەکاریت

لەگــــەڵ هاوەڵانــــت وەفاداریـــــت

چـــرای ڕێگەمــــە ڕابـــــەری ژیـــــنم

هـەر لـەخووی شـیرین هـەتاکوو پیریـت

دەسـت و دەم پاکیـت زانـایی و ژیریـت

هــــەموو دانایــت تـــا بـیر و هۆشـــت

هــەموو تەمــەنت تــا مــەرگ و کۆچـت

چـــڕای ڕێگەمــــە ڕابـــــەری ژیـــــنم

( ٥ )

## لەهەولێرەوە بۆ مەدینە

لەهەولێرەکەی یەکەم لانەی ژین

بۆ مەدینەی یەکەم پەناگەی دین

بارگەم تێک ئەنێم وەرێ ئەکەوم

تا پێی شاد نەبم بەدڵ ناسرەوم

ئەچم بە کۆڵێ قسە و باسەوە

بەهەگبەی پڕ لەباس و خواسەوە

نۆژداری برینی منی لەوێیە

هەر ئەو دەوای دەردی من پێیە

پێی ئەڵێم کوردم کەلێکی مەردم

بوێر و دلێر ئازا و نەبەردەم

صلاح الدینیم نەوەی گابانم

فیدای رێگەتم بەخوێن و گیانم

ویستیان دەنگ و رەنگم بسڕنەوە

رێچکە و ڕەچەڵەکم ببڕنەوە

شار و گوندیان تەخت و وێران کردم

سەر و سامانیان بەتاڵان بردم

مزگەوتەکانیان هەمووی خاپوور کرد

قورئانەکانیان گشتی پەرپووت کرد

بەڵام بەباوەڕی پۆڵاینم

بەپشتی تەنها بەخوا بەتینم

لەهەڵمەتی سەر کێوەکانم

شەکاوەیە ئاڵای کوردستانم

( ٦ )

## ژانی کۆچ

ئـەو پێغەمبـەرەی مانـدوو نـەناس بـوو

خـودا یـاری بـوو هەرچـەند کەسـاس بـوو

مەینـــەتی کۆچـــی دڵ دەگرێنـــێ

شـــەکەتی ڕێگـــای ڕۆح دەهـــەژێنێ

ئـەم کێـو و ئـەم کێـوی کـرد پیـادە بـوو

بـــەپیر مەرگـــەوە چـــوو ئامـــادەبوو

هـەردوو کـەس بـوون بـەڵام دامـاو نـەبوون

نـــەیارانی ئامـــاج پێکـــاو نـــەبوون

مشـــتێ خـــۆڵی وەشـــاند کـــوێری کـــردن

بەچەشـــنی گوڵلـــەی وێڵـــی لێ کـــردن

کێیـــە ئـــەو کەســـەی هـــاوەڵی ڕێتـــە

خـــۆی و دەســـت مایـــەی بەفیـــدای ڕێتـــە

خـــۆت هـــەڵت بـــژارد جێگـــەی بـــاوەڕە

وێنـــەی بەخشـــینە لووتکـــەی بـــاوەڕە

چ هەســـتێ بـــێ ئێدڕاکـــە لـــەنوورت

کوێره لەئاست میهری بێ سنوورت

شێتانه بانگی ڕەوایان نەبیست

بەختیاری هەردوو دنیایان نەویست

کەهەڵاتن خۆر و مانگی دابان

لەسەر چڵی دار بوو بەچراخان

ئەوسا ڕێژی کرد زامی نادادی

وەلای نا خەم و دەردی بێگاری

(٧)

## گڕی عەشق

کاتێ دڵ لەعیشقت سەروەرم گڕ ئەگرێ
زمان دێتە گەڕ ئاوازی غوربەت ئەچڕێ
لەسۆزت تریەی دڵ ئەگۆڕێ بەناڵە
لەمەیلت هەروەکو بادەی مشت و ماڵە
گەر مەجنون لەدەردی عەشق دا بناڵێ
ئەبێ من ببم بەمەل بفڕم بەباڵێ
مۆخ لەمەدحی ئەو سەردار جامێ سەهۆڵە
سوێند ئەخۆی کاسەی سەر بەوێنەی دەهۆڵە
چۆن جەستە و دەروون هەستی گریانی هەیە
ڕۆحیش بەئەندێشە مەیلی گەشتی هەیە
ئاسمانەکان ئەبڕێ ڕووە و عەڕشی فەلەک
ئەگات بەئەرواحی ئینس و مەلەک
قەبوول بفەرموو ئەی ڕۆحی پاکی حەبیب
بۆ منی لەدووری تۆ غەمگین و حەزین
گەرچی تامەزرۆ و دەروون و دڵ سووتاوم
گڕی خۆشەویستیت بەربۆتە هەناوم
تەنیا دوو ووشە دەرئەبڕم ئەی سەروەرم
دەستم دامێنە تینووی ئاوی کەوسەرم
بەس مەگەر تۆ پێم ببەخشی قومێ لەئاو
بۆ کوژانەوەی گڕی دۆزەخ و هەناو

( ٨ )

## ڕەسولم

ڕەسولم تۆی حەبیبم — بۆ دەردی دڵ تەبیبم
بەدەستت ئاوی کەوسەر — خوایە بیکەی نسیبم
لەجوانی ڕوو ڕوخسارت — لەڕەوشت و ئاکارت
خودا شایستەی زانی — کردیە شەوقی جەماڵت
هەم نەبی و هەم پەیامبەر — هەم شەفیعی لەمەحشەر
بەسۆز و میهرەبانی — بۆ گشت جیهان سەرانسەر
خۆش گوفتاری نەرم و نیان — بەفیدات بێ دڵ و گیان
پێشکەشی ڕێبازت بێ — نەهەر ساتێ هەموو ژیان
بەڕاست گۆیی و دەست پاکی — هەڵت هێنا ڕۆناکی
پیشەت بوو شەونخونی — لەماندوبوون بێ باکی
بەڵێن بێ ڕێگەت بگرم — لەسەری بژیم بمرم
پەیامی بەرز و جوانت — بکەم بەبیر و هزرم

( ٩ )

## لەدایك بوونی ئازیز

لەدایك بوونت ئازیز   بەهاربوو ماڵی پایز

وەکو خۆرێ بوو هەڵات   دای لەگشت شارو وڵات

بۆ گشت جیهان سەلماندی   هەرچی شابوو هەژاندی

تۆ مامۆستا و پێشەنگی   تۆ لابەری ئاستەنگی

تۆ کۆتەڵ شکێنەری   هۆشدار و ترسێنەری

نەت هێشت پەرتی و جودایی   چاندت داری تەبایی

ڕۆژێکی نوێت داهێنا   تیشکی ئازادیت هێنا

فێرت کردین برا بین   تەنها بەندەی خودا بین

سەر دانەنوێنین بۆ کەس   بۆ یەزدانی پاك و بەس

سەردەمت چەند زێڕین بوو   وەرزی بەختیاری ژین بوو

هەزار درووودت لەسەر   تۆی سەردار و تۆی سەروەر

وەرگێرانی ئەم پەرتوکە پڕسوودە کۆتایی هات لەخوا داواکارم لێمی وەرگرێت ودووری کات لەریایی و ڕیابازی وشەرمەزاری بازاری قیامەت نەبین. وە خوا لەخۆمان ماڵ ومنالمان ودایکم خۆش بێت هیدایەتی موسلمانان بدات بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام

واخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمین

له ٨ی /جمادی یەکەم /١٤٣٤ کۆچی

بەرامبەر ٢٠١٣/٣/٢٠ رۆژی چوارشەم

کاتژمێر ٩.٣٠ی بەیانی لەماڵەوە لە گەرەکی گوڵان / لەهەولێر

## پێرستەکان